

# ١٠٣

# پرسیار و وەڵامی شەرعی لەسەر ڕەمەزان



ئامادەکردنی
خدر حەمەد خەتی





چاپی یەکەم - ٢٠١٥

١٠٣

# پرسیار و وەڵامی شەرعی

# لەسەر رەمەزان

ئامادەکردنی

خدر حەمەد خەتی

١٤٣٦ ٢٠١٥

ناوی کتێب: (١٠٣) پرسیار و وەڵامی شەرعی لەسەر رەمەزان

بابەت : ئایینی

ئامادەکردنی : خدر حەمەد خەتێ

چاپی یەکەم ١٤٣٦ك- ٢٠١٥ز

تیراژ : ١٢٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان

ژمارە سپاردنی(410 ) ی 2015ی پێدراوە

## پێشکەشە بە:

- روحی دایك و باوکم.
- زانایان.
- بانگخوازان و فێرخوازان.
- رۆژوگران.
- برادەر و خزم و دۆستان.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

# پێشەکی

إِنَّ الْحَمْدَ لِلَّهِ نَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ وَنَعُوذُ بِهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا مَنْ يَهْدِ اللَّهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللَّـهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ .

١- يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلَـا تَمُـوتُنَّ إِلَّـا وَأَنْـتُمْ مُسْلِمُونَ .

٢- يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَاءً وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَـاءَلُونَ بِـهِ وَالْأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا .

٣- يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلاً سَـدِيدًا يُصْـلِحْ لَكُـمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَـدْ فَـازَ فَـوْزًا عَظِيمًا.

خوشك و برای موسڵمان هەر قسەی خێر بكەن تا دوا هەناسەی ژیان ، بۆچی؟ وەلآم لەبەر ئەوەی نزیكەی (٤) ساڵ پێش ئێستا كورێكی گەنجی تۆبەكار بەناوی كاك (هەڵمەت) داوای لێكردم شتێك لەسەر رەمەزان بنوسم ، منیش نامیلكەیەكم ئامادەكرد بەناوی (٤٢) پرسیار و وەلآم لەسەر رەمەزان، دوای دانەیەكم لەم نامیلكە دایە كاك حاجی (سەردار) ی بەرێوەبەری گشتی وەزارەتی مالیە ، خوێندیەوە وتی خۆزگە (١٠٠) پرسیار و وەلآم دەبوو، ئێستا كاك حاجی سەردار وەفاتی كردیە، بەلآم قسە خێرەكەی لە هزرم دەزرنگایەوە ، ناوی خوام لێ هێنا بۆ هێنانەدی خۆزگەكەی ،ئەو پیاوێك بوو، هەموو دووشەم و پێنج شەم بە رۆژوو دەبوو، لەسەر (٤) قورئانان دەیخوێند ١- بەیانی لە ماڵ پێش هاتنە دەوام ٢- لە فەرمانگە كاتی دەست بەتاڵی ٣- پاش دەوام لە یانەی وردبینان و ژمێریاران ٤- لە بەشی ژمێریاری كارگەی ئالیكسازی كە رۆژی شەممە لەوێ دەبوو،وەك وردبینی دەرەكی(المدقق الخارجی)، هەرشوێنەو قورئانێكی لێ دانابوو، زۆر دۆستی هەژاران بوو، زۆر سادە بوو، پیاوی دینداری زۆر خۆشدەویست، زۆر دەست پاك بوو، زۆر دژی گەندەڵی بوو، لە (٣) شت ماندوو نە دەبوو ، ١- دینداری ٢- ئیش كردن ٣- پیداكرنی زانست لە بواری خۆی ، زۆر ئیشی بۆ

خەڵك دەكرد بێ بەرامبەر،لەسەردانی نەخۆش و سیلەی رەحم زۆر ئازابوو،زۆر ستايشی هاوسەرەكەی دەكرد،بۆ خەڵك زۆر بەسود بوو،سەخی ودەستكراوەبوو،ئيشی دەكرد بۆ دوای مردن،هەزاران رەحمەت لەگۆڕی لە خوای گەورە دپارێمەوە جێگای بەهەشتی پان و بەرين بێ، ئەمە بەرهەمی ئاخاوتن و قسەی خێرە جا ئەمە بيرۆكەی ئەم پەرتووكەی بەر دەستی بەرێزتە ، وەڵامی زۆربەی ئەم پرسيارانە دەداتەوە كە لە رەمەزان توشيان دەبێ ، يان بە بيرت دادێن، لەكۆتايی دواكارم خوای گەورە رەمەزان لە ئێمە و هەموو موسڵمانان وەرگرێ، وە خۆمان و ماڵ و منداڵ وكوردستانمان بپارێزی و بمانخاتە سەر راستەشەقامی ئيسلام. امين

خدر حمد خەتی

پێش نوێژ(امام) لە مزگەوتی عوزێری

٧ شەعبان١٤٣٦ – ٢٠١٥/٥/٢٥

## پرسیاری(۱) ئایا فەزل و گەورەیی ڕۆژوو چەندە؟

وەڵام : چەندین دەق لەسەر گەورەیی ڕۆژووی ڕەمەزان هەیە تەنها (۳) فەرموودە دەهێنینەوە

۱-لە ئەبو هورەیرە هاتوە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) ، قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ كُلُّ عَمَلِ ابْنِ آدَمَ لَهُ إِلاَّ الصِّيَامَ فَإِنَّهُ لِى وَأَنَا أَجْزِى بِهِ وَالصِّيَامُ جُنَّةٌ فَإِذَا كَانَ يَوْمُ صَوْمِ أَحَدِكُمْ فَلاَ يَرْفُثْ يَوْمَئِذٍ وَلاَ يَسْخَبْ فَإِنْ سَابَّهُ أَحَدٌ أَوْ قَاتَلَهُ فَلْيَقُلْ إِنِّى امْرُؤٌ صَائِمٌ. وَالَّذِى نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لَخُلُوفُ فَمِ الصَّائِمِ أَطْيَبُ عِنْدَ اللَّهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنْ رِيحِ الْمِسْكِ وَلِلصَّائِمِ فَرْحَتَانِ يَفْرَحُهُمَا إِذَا أَفْطَرَ فَرِحَ بِفِطْرِهِ وَإِذَا لَقِىَ رَبَّهُ فَرِحَ بِصَوْمِهِ )البخارى ، ومسلم ، والنسائى .

واتە:خوای گەورە و بەدەسەلآت ئەفەرموێت :ئادەمیزاد هەموو کردەوە چاکەکانی بۆ خۆیەتی جگە لە ڕۆژوو کە بۆ منەو هەر خۆم پاداشتی ئەدەمەوە ،وە ڕۆژوو قەڵغانی گوناحە،جا ئەگەر هەر کەسێك بە ڕۆژوو بوو با قسەی ناشیرین و هاوار هاوار نەکات و نەزانی نەکات بەرامبەر بە خەڵك، ئەگەر کەسێك جوێنی پێدا یان شەڕی لەگەڵدا کرد دوو جار بڵێت:من بە ڕۆژووم،بەو زاتەی گیانی محمدی بە دەستە بۆنی دەمی ڕۆژووان لە ڕۆژی دواییدا لای خوا لە بۆنی میسك

خۆشترە.وە بۆ ڕۆژووان دوو خۆشی هەیە دڵیان پێ خۆش ئەکات یەکەمیان:کاتێ ڕۆژووەکەی ئەشکێنێت دڵ خۆش ئەبێت،کاتێ ئەگات بە خوا دڵ خۆشە بە رۆژووەکەی کە فەرمانی خوای بەجێ هێناوە.

٢-لە عەبدولای کوری عەمرەوە خوایان لێ رازیبێت هاتووە کە پێغەمبەر فەرموویەتی (ﷺ) الصِّيَامُ وَالْقُرْآنُ يَشْفَعَانِ لِلْعِبَادِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ، يَقُولُ الصِّيَامُ : رَبِّ إِنِّي مَنَعْتُهُ الطَّعَامَ وَالشَّرابَ بِالنَّهَار فَشَفِّعْنِي فِيهِ ، وَيَقُولُ الْقُرْآنُ رَبِّ مَنَعْتُهُ النَّوْمَ بِاللَّيْلِ فَشَفِّعْنِي فِيهِ ، فَيَشْفَعَانِ.)(رواه احمد )

واتە :رۆژوو قورئان لە رۆژی دواییدا تکا کاری بەندەکانی خوان .رۆژوو ئەڵێت:ئەی پەروەردگار من نەم هێشتوە بە رۆژ خواردن بخوات و ئارەزووەکانی بەجێ بگەیەنێت،خوایە تکات لێ ئەکەم لێی ببورەو تکاکەم وەربگرە.وە قورئان ئەڵێت :ئەی پەروەردگارم من نەمهێشتوە بە شەو بخەوێت ،تکات لێ ئەکەم لێ ی ببورە تکاکەم وەربگرە،وە خوای گەورە تکای هەردووکیان وەر ئەگرێت.

٣- وەهەروە ها . (عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ)قَالَ يَقُولُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ الصَّوْمُ لِي وَأَنَا أَجْزِي بِهِ يَدَعُ شَهْوَتَهُ وَأَكْلَهُ وَشُرْبَهُ مِنْ أَجْلِي ) صحيح البخاري،واتە: پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت خوا دەفەرموێت: رۆژوو بۆ منە و خۆم پاداشتی دەدەمەوە ، چونکە بەندە لەبەر من وازیهێناوە لە ئارەزوو و خواردن و خواردنەوە. جا هەندێ لەزانایان

(ﷻ)دەڵێن (وَأَنَا أَجْزِي بِهِ) ڕێزیکی تایبەتە بۆ ڕۆژوو ،هەندێ دەڵێن ئەگەر کابرای بە ڕۆژوو مافی خەڵکی لەسەر بوو خەڵك دێن مافی خۆیان دەبن لە چاکەکانی لە ڕۆژی قیامەت ،بەڵام خوا ناهێڵێ کەس ڕۆژوو وەکەی ببات ئەفەرمووێ ڕۆژوو بۆمنە ، خاوەن ماف لەجیاتی ڕۆژوو ڕازی دەکات.

چونکە مرۆڤی واهەیە لە قیامەت سفر دەبێ لەچاکە وەك لەم فەرموودە هاتووە(عن أبي هُريرةَ – رضي الله عنه – : أنَّ رسولَ الله (ﷺ) ، قَالَ : (أتدرونَ مَنِ المُفْلِسُ ؟) قالوا : المفْلسُ فِينَا مَنْ لا دِرهَمَ لَهُ ولا مَتَاع ، فَقَالَ : ( إنَّ المُفْلسَ مِنْ أُمَّتِي مَنْ يأتِي يَومَ القيامَةِ بصلاةٍ وصيامٍ وزَكاةٍ ، ويأتِي وقَدْ شَتَمَ هَذَا ، وقَذَفَ هَذَا ، وَأَكَلَ مالَ هَذَا ، وسَفَكَ دَمَ هَذَا ، وَضَرَبَ هَذَا ، فيُعْطَى هَذَا مِنْ حَسَنَاتِهِ ، وهَذَا مِنْ حَسناتِهِ ، فإنْ فَنِيَتْ حَسَنَاتُه قَبْل أنْ يُقضىَ مَا عَلَيهِ ، أُخِذَ مِنْ خَطَاياهُم فَطُرِحَتْ عَلَيهِ ، ثُمَّ طُرِحَ فِي النَّارِ ) رواه مُسلم .پێغەمبەر فەرمووی یائا دەزانن مایە پوچ کێیە ؟وتیان مایە پوچ لای ئێمە ئەوەیە نە درهەمی هەبێ نە کەلوپەل،فەرمووی : مایە پوچی ئوممەتی من لەڕۆژی قیامەت دێت نوێژی کردیە ،بەڕۆژوو بووە، زەکاتی داوە،بەڵام جوێنی بەوە داوە،بوختانی بەوە کردیە،مالی ئەوەی خواردوە،خوێنی ئەوەی ڕشتووە،لەوەی داوە،جا هەرکەس و مافی خۆی لەچاکەکنی دەبات تا چاکەکانی کۆتایی دێت،جا کە چاکەکان نەما ، لەخراپەی

خاوەن مافەکان دەخەنە سەر خراپەی ئەم پیاوە، دواتـر فرێئەدرێتـە ناو ئاگر.

## پرسیاری( ٢ ) بۆچی رەمەزان ناونراوە ( رەمەزان ) ؟

وەڵام.. دووبۆچوون هەیە

١. دەڵێن لە وشەی (رمض) وەرگیراوە واتا سەختی گەرما

٢. بۆیە ناونراوە رەمەزان چونکە گوناه دەسوتێنێت

وە هەندێ کەس ووشەی (رمضان) والێکدەدەنەوە.

(ر) واتە: (رحمة)رەحمەت و بەزەیی و مهربانی

(م) واتە:(مغفرة) مەغفیرەت و لێخۆشبوون

(ض) واتە:(ضمان) دەستەبەر و زەمانەت بۆنەچوونە ئاگر

(أ) واتە: (أمان) ئەمانەدان بەو کەسەی کە بەرۆژوو بووە

(ن) واتە: (النجاة) نەجات و رزگاربوون لەدۆزەخ

## پرسیاری( ٣ ) کەی رەمەزان فەرزکرا؟ وە روکنی چەندەمە؟

وەڵام : لەرۆژی دووشەمە،لەمانگی شەعبانی، ساڵی دووی کۆچی فەرز کرا،کەروکنی چوارەمی ئیسلامە.

## پرسيارى( ٤ ) مەرجەكانى واجب بوونى رۆژوو چەندن؟

وەڵام : مەرجەكانى واجب بوونى رۆژوو چوارن

١-الاسلام.كابرا موسڵمان بێت

٢ -العاقل.ژيربێت

٣-البلوغ.بالغ بێت واتە منداڵ نەبێت

٤-تواناى هەبێت بەرۆژو ببێت

## پرسيارى( ٥ ) ئايا پێناسەى رۆژوو لەرووى زمان وشەريعەتەوە چييە؟

لەزمانەوانيدا واتە خۆگرتنەوە لە شت چ قسە بێت چ خواردن بەڵگەى ئەوەش فەرمودەيەكى پەروەردگارى جيهانيانە كەدەفەموويێت (إِنِّي نَذَرْتُ لِلرَّحْمَنِ صَوْماً فَلَنْ أُكَلِّمَ الْيَوْمَ إِنسِيّاً) ٢٦ مريم

بە (ئيشارەت) پێى بڵێ بەڕاستى من قسە نەكردنم لەسەر خۆم نەزر كردووە بۆ (خواى) ميهرەبان لەبەرئەوە ئەمڕۆ قسە لەگەڵ هيچ كەسێكدا ناكەم.

وە. رۆژوو لەشەرعدا: خۆگرتنەوەيە لەو شتانەى رۆژو دەشكێنن، لە خۆرهەڵاتنەوە تا خۆرئاوابوون لەگەڵ بوونى نيەتتدا.

## پرسیاری ( ٦ ) مێژووی تەشریع و واجب بوونی ڕۆژوو کەی بوو؟

وەڵام : ڕۆژی مانگی ڕەمەزان لەمانگی شەعبانی ساڵی دووەمی کۆچی دا فەرز کرا ڕۆژوو پێش ئەوەش لەناو ئوممەتانی پێشوودا هەر هەبووە، پەروەردگار دەفەرموێت. ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ١٨٣﴾ البقرة: ١٨٢

~~ڕۆژوو پێش ئەوەش لەناو ئوممەتانی پێشوودا هەر هەبووە، پەروەردگار دەفەرموێت~~

واتە:ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە ڕۆژووتان لەسەر نوسراوە هەروەك نوسراوە لەسەر ئەوانەی لە پێش ئێوە دابوون بۆ ئەوەی خۆتان بپارێزن.

## پرسیاری( ٧ ) ئایا چەند جار ووشەی (رَمَضَانَ ) لەقورئان دا هاتووە؟

وەڵام: ووشەی ( رَمَضَانَ ) یەك جار لەقورئان دا هاتووە پەروەردگار دەفەرموێت،﴿ شَهۡرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ فِيهِ ٱلۡقُرۡءَانُ هُدٗى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَٰتٖ مِّنَ ٱلۡهُدَىٰ وَٱلۡفُرۡقَانِۚ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهۡرَ

فَلْيَصُمْهُ وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلْعُسْرَ وَلِتُكْمِلُوا۟ ٱلْعِدَّةَ وَلِتُكَبِّرُوا۟ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَىٰكُمْ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴾ البقره ١٨٥ واتە: (خوای گەورە وەسف وسەنای مانگی رەمەزان دەکاو دەفەرموێ: شهر رمضان الذی أنزل فيه القرآن مانگی رەمەزان، ئەومانگەیە کە قورئانی تێدا نێردراوەتە خوارێ، واتە: لەڕەمەزاندا (دەست بەناردنی کراوە) هدی للناس رێنمایی مەردم دەکا بۆ گشت کارێکی چاك وبينات من الهدی والفرقان و چەندین بەڵگەو نیشانەی زۆر روونی تێدایە بۆ شارەزای رێی هەق و، جیاکردنەوەی راست و ناڕاست فمن شهد منكم الشهر فليصمه ئینجا هەرکەسێکتان مانگی رەمەزانی بەسەرهات، وەرێبوارو نەخۆش نەبوو، بڕو بیانووی شەرعیشی نەبوو، دەبێ بەرۆژوو بێت فمن كان منكم مريضا أوعلي سفر ئینجا ئەوکەسەشتان نەخۆش و لەش بەبارە، یا لەسەفەرەو رێبوارەو، رۆژووەکەشی دەشکێنێ فعدة من أيام أخر دەبێ لە رۆژانی دیکەدا، چەند رۆژێکی تر بەقەزا بگرێتەوە يريد الله بكم اليسر خوا ئاسوودەیی و کارئاسانی ئێوەی دەوێ ولا يريد بكم العسر و لەئەنجامدانی فەرزەکاندا، نایەوێ بکەونە تەنگیی و ناڕەحەتیی ولتكملوا العدة ودەیەوێ بەئاسانی رۆژووی ئەوماوە تەواوبکەن

ولتكبروا الله علي ما هداكم و بەگـەورەيی خـوا بـزانن وقايـل بـن، كـە ئێوەی رێنماكرد لعلكم تشكرون پێويستە سوپاسی بكەن لەسـەر ئـەو مۆڵەتدانەو سەخت نەگرتنەی.

## پرسيارى( ٨ ) ئايا بەچی مانگی رەمەزان واجب دەبێت؟

وەلاّم : مانگی رەمەزان بەيەكێك لەم دوو شتە واجب دەبێت

١.بينينی مانگ بە شاهيدێكی عاديل.

٢.تـەواو كردنـی مـانگی شـەعبان بەسـی(٣٠)رۆژ،.ئەمـەش كاتێـك لەبەر نەديتنی مانگ لە بەرهەور يان لەبەر نەهاتنی شايەدێكی عاديل.

بەڵگەش لەسەر خاڵی ١و٢ ئەم فەرمودە شيرينەيە

پێغەمبەرمان (ﷺ) فەرموويـەتی (صُومُوا لِرُؤْيَتِهِ ، وَأَفْطِرُوا لِرُؤْيَتِهِ ، فَإِنْ غُمَّ عَلَيْكُمُ الشَّهْرُ فَعُدُّوا ثَلاثِينَ. رَوَاهُ مُسْلِمٌ فِي الصَّحِيحِ عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ مُعَاذٍ) واتە:كـە مانگتـان دی بـە رۆژو بـن و كـە مانگتـان بينی بيشكێنن.ئەگەر هەور بوو، ئەوا (شعبان)تەواو بكەن و بيكەن بە سی (٣٠) ڕۆژ.

## پرسیاری( ۹ ) ئایا پێغەمبەر (ﷺ) چەند (رَمَضَانَ )ی گرتوە لە ژیانیدا ؟

وەڵام : پێغەمبەر (ﷺ) لە ژیانی پیرۆزیدا (۹)ساڵ ڕۆژووی ڕەمەزانی گرتووە (۸)ساڵیان مانگی ڕەمەزان(۲۹) ڕۆژ بووە.وە (۱) ساڵ ڕەمەزان (۳۰) ڕۆژ بووە.

## پرسیاری( ۱۰ ) ڕەمەزان بە چەند شاهێد جێگیر دەبێت؟

وەڵام : بە یەك شاهیدی عادیلی دادپەروەر جێگیر دەبێت بەبەڵگەی.( عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ : تَرَايَا النَّاسُ الْهِلاَلَ فَأَخْبَرْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) أَنِّى رَأَيْتُهُ فَصَامَ وَأَمَرَ النَّاسَ بِصِيَامِهِ)رواه ابوداود. واتە بەپێغەمبەرم راگەیاند من مانگی یەك شەوەی رەمەزانم دیتوە،ئینجا پێغەمبەر بە رۆژوو بوو، فەرمانیشی دا خەڵك بە رۆژووبن.

## پرسیاری( ۱۱ ) مەرجەكانی واجب بوونی ڕۆژوو چەندن؟

وەڵام: مەرجەكانی واجب بوونی ڕۆژوو چوارن؟

۱- موسڵمان بێت

۲- ژیر بێت

۳- بالغ بێت

٤- توانای هەبێت بەسەر ڕۆژوو گرتندا

## پرسیاری( ١٢ ) ئاداب و ڕەوشتی ڕۆژوو چین؟

وولاّم : هـەر کـەس بـە ڕۆژو بێـت موسـتەحەببە پـەیڕەوی ئـەم دەستورانەی خوارەوە بکات

١ پارشێوکردن پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت (تَسَحَّرُوا فَإِنَّ فِـي السَّحُورِ بَرَكَةً)رواه البخاری ومسلم) واتـە پارشـێو بکەن چونکە لـە پارشێو کردندا بەرەکەت هەیـە..وە دەفـەرموێت ({عَلَيْكُمْ بِالسَّحُورِ ، فَإِنَّهُ الْغَدَاءُ الْمُبَارَكُ ، وَأَسْفِرُوا بِهِ ما اسْتَطَعْتُمْ ، وَتَسَحَّرُوا وَلَوْ بِجُرْعَـةٍ مِنْ مَاءٍ) الطبراني في معجمه الكبير) واتـە : پارشـێو بکەن چونکە خواردنی پارشێو خواردنێکی موبارەکە ،هـەتا دەتـوانن دوای بخـەن ، پارشیو بکەن ئەگەر بە قومە ئاوێکیش بێ. (عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْحَارِثِ عَنْ رَجُلٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (ﷺ)أَنَّ رَجُلًا دَخَلَ عَلَـى النَّبِـيِّ (ﷺ) وَهُوَ يَتَسَحَّرُ فَقَالَ إِنَّ السَّحُورَ بَرَكَةٌ أَعْطَاكُمُوهَا اللَّهُ عَـزَّ وَجَـلَّ فَلَـا تَدَعُوهَا)

(السَّحُورُ بركةً فلا تدعوه ولو ان يجرع احدكم جرعة ماء فإنّ الله وملائكته يصلون على المسَحرين) رواه احمد . واتە : خـواردنی پارشـێو بەرەکەتـە ، واز لەپارشـێوکردن مەهێنن،ئەگـەر یـەکێك لـە ئێـوە بـە قومێك ئاویش بێت، هەر پارشێو بکات،چونکە خـوا ڕەحمـەتی خـۆی ئەرژێنێ و فریشتەکان ئەپاڕێنەوە بۆ پارشیوکەران.

**ئاگاداری** : کاتی پارشێو لە نیوەی شەوە دەست پێ دەکات تاکو بانگی بەیانی بەلاَم دواخستنی خێرترە. (لاَ تَزَالُ هَذِهِ الأُمَّةُ بِخَيْرٍ مَا أَخَّرُوا السَّحُورَ وَعَجَّلُوا الْفِطْرَ. رَوَاهُ أَبُو يَعْلَى ، وَأَحْمَدُ/

**واتە: بەردەوام خەڵك لە خێردان مادام پارشێو دوادەخەن و بەریانگ زوو دەكەنەوە.**

٢ : پەلە کردن لە بەربانگ کردنەوە: پێغەمبەر دەفەرموێت (ﷺ) (لاَ يَزَالُ النَّاسُ بِخَيْرٍ مَا عَجَّلُوا الفِطْرَ) رواه البخاری و مسلم. واتە: بەردەوام خەڵك لە خێردان مادام پەلە بکەن لە ڕۆژو شکاندندا. ڕۆژو شکاندنیش سوننەتە بە خورما ئەگەر خورما نەبوو بە ئاو.

٣: دوعا کردن

٤ : وازهێنان لەو شتانەی لەگەڵ ڕۆژودا ناگونجێن وەك قسەی خراپ-جوێندان-تورەبوون-برینداركردنی هەستی خەڵكی-غەیبەت كردن-غەدر و زوڵم كردن.......هتد) هەمو كار و كردەوەیەكی خراپ كار لە ڕۆژوو دەكات وەك پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت (رُبَّ صَائِمٍ لَيْسَ لَهُ مِنْ صِيَامِهِ إِلَّا الْجُوعُ وَرُبَّ قَائِمٍ لَيْسَ لَهُ مِنْ قِيَامِهِ إِلَّا السَّهَرُ : صحيح سنن ابن ماجة) واتە زۆر ڕۆژووان هەیە لە برسێتی بەو لاوە هیچی بۆ نامینێتەوە ،وە زۆر شەو نوێژ كەریش هەیە لە بێ خەوی بەو لاوە هیچی بۆ نامینێتەوە.

٥ : سیواك كردن (هەموو كاتێك) ڕەوایە.

٦: سەخاوەت و قورئان خوێندن

عن ابن عباس رضی الله عنهما: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) أَجْوَدَ النَّاسِ بِالْخَيْرِ ،وَكَانَ أَجْوَدَ مَا يَكُونُ فِي رَمَضَانَ حِينَ يَلْقَاهُ جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلَامُ ، وَكَانَ جِبْرِيلُ يَلْقَاهُ كُلَّ لَيْلَةٍ فِي رَمَضَانَ حَتَّى يَنْسَلِخَ يَعْرِضُ عَلَيْهِ النَّبِيُّ (ﷺ)الْقُرْآنَ. فَإِذَا لَقِيَهُ جِبْرِيلُ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) أَجْوَدَ بِالْخَيْرِ مِنَ الرِّيحِ الْمُرْسَلَةِ.)رواه الشيخان

واتە: پێغەمبەر خوا(ﷺ) سەخیترین کەس بوو، وە لەکاتێکدا ، کە لەرەمەزاندا بە جیبریل دەگەیشت لە هەموو کاتێدا بەخشەرتربوو،کەهەموو شەوێکی رەمەزان پێی دەگەیشت قورئانی لەگەڵ دەور دەکردوە،ئا ئە لەو کاتەدا پێغەمبەری خوا لە بەخشیندا لە بای هەڵکردو خێراتربوو.

٧ : تێکۆشان لە خوا پەرستیدا : لە دە ڕۆژی دوایی ڕەمەزاندا .بوخاری و موسلیم لە عائیشەوە ئەگێرنەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) کاتێ ئەگەیشتە دە ڕۆژی دوایی ڕەمەزان شەوانی زیندوو ئەکردەوە بە عیبادەت و خێزانەکانی هەڵئەستاند و بەندو خێنەی توند ئەکرد..( كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ)إِذَا دَخَلَ الْعَشْرُ أَيْقَظَ أَهْلَهُ وَرَفَعَ الْمِئْزَرَ قِيلَ لِأَبِي بَكْرٍ مَا رَفَعَ الْمِئْزَرَ قَالَ اعْتَزَلَ النِّسَاءَ.اخرجه احمد واتە : کاتێ پێغەمبەری خوا دەگەیشتە دە شەوی کۆتایی رەمەزان ، خێزانەکانی هەڵدەساند ، و خۆی دوور دەخستەوە لە خێزانەکانی .

**پرسیاری(١٣) ئەو شتانە چین کە بۆ ڕۆژووان (صائم)ڕەوایە؟واتە جائزە؟**

١-خۆ خستنە ناو ئاو و خۆ نوقم کردن تێیدا

٢-چاو ڕشتن بە کل جائیزە بەڵام دڵۆپە قەترەی گوێ ڕۆژوو دەشکێنێ قەترە کردنەوەی ناو چاو ڕۆژوو ناشکێنێت ،چونکە دەرچەیەکی کراوە نیە حوقنە لەکۆمەوە ڕۆژوو دەشکێنێت ؛چونکە کۆم دەرچەیەکی کراوەیە حوقنە لەخوێنەوە ڕۆژوو ناشکێنێت، چونکە دەماری خوێن دەرچەیەکی کراوەنیە ...

ئەمانی تریش بەم شێوەیەن.

زانایان بەکەراهەتی ئەزانن کە ڕۆژو وان قەترە بکاتە لوتی ،ئەڵێن ڕۆژووی پێئەشکێت .

٣-ماچکردنی ژن و مێرد: ماچکردن بۆ کەسێك کە توانای بەسەر خۆیەوە هەبێت ڕەوایە. بەڵام ئیمامی(النواوی) دەفەرموێت ناپەسندە، بە نا پەسندێکی حەڕام، چونکە مەترسی توشبونی حەڕامی لێ دەکرێت، کەواتە ئەگەر کەسێك توانای بەسەرخۆدا نەبوو با دوور بکەوێتەوە لەم کارە .لە فقە السنە هاتووە.

(عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّاب رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ هَشَشْتُ يَوْمًا فَقَبَّلْتُ وَأَنَا صَائِمٌ فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقُلْتُ صَنَعْتُ الْيَوْمَ أَمْرًا عَظِيمًا فَقَبَّلْتُ وَأَنَا صَائِمٌ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) أَرَأَيْتَ لَوْ تَمَضْمَضْتَ بِمَـــاءٍ

وَأَنْتَ صَائِمٌ قُلْتُ لَا بَأْسَ بِذَلِكَ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فَفِيمَ) واتە: لە عومەرەوە هاتووە،فەرموویەتی : رۆژێك ئارەزووم جولاو خێزانی خۆم ماچ کرد بە رۆژووش بووم، هاتم بۆ لای پێغەمبەر پێم ووت : ئێمرۆ کارێکی گەرەم کردوە بەزمانی بە رۆژوووەوە ماچم کردوە، پێغەمبەر فەرمووی (أَرَأَيْتَ لَوْ تَمَضْمَضْتَ بِمَاءٍ وَأَنْتَ صَائِمٌ قُلْتُ لَا بَأْسَ بِذَلِكَ ). واتە ئەگەر بە رۆژوو بیت و ئاو لە دەمت رادەی چی ئەبێت ؟ وتم ئەوە قەیناکە ، ئەی بۆچی پرسیار ئەکەیت ئەمەش وەك ئەوەیە.وەهەر وەها سابت بوو لەعائشەوە فەرموویەتی پێغەمبەر بەرۆژوو بووە ماچی کردوە، وە بە رۆژوو بووە و یاری لەگەڵ خێزانەکانی کردوە، بەلأم لە هەموو کەس بەتواناتر بوو بەسەرخۆیدا.

٤-دەرزی لێدان.

٥-ئاو لە دەم و لوت ڕادان.

٦-وە هەروەها ڕەوایە ئەو شتانەی کە ناتوانرێت خۆیان لێ بپارێزرێت وەك:

أ-قوت دانی تف ب- تۆز ج-خۆڵی ڕێگا د- تۆزی هاردی بێژراو هـ- تۆزی پوش و گیا

٧-خۆ چەورکردن

٨-بە زۆر جیماعکردن

٩-احتلام بوون ڕۆژ و ناشكێنیٚ

١٠-كەڵە شاخ گرتن(حجامە)

١١-خوێن گرتنیش ڕۆژو ناشكێنیٚ چ لە دەمار چ لە پێست.

١٢-ڕەوایە بۆ ڕۆژووان ڕۆژ بكاتەوە بەلەشی گرانەوە(جەنابتدار)ی

١٣-ژنـی بـیٚ نوێـژ و زەیسـتان ئەگـەر لـە شـەو دا پـاك بونـەوە دروستە بۆیان خۆ شتن دوا بخەن هـەتا بـەیانی ، وە بـە ڕۆژو بونیـان دروستە،پاشان لە سەریانە خۆیان بشۆن بۆ نویژەكانیان

## پرسیاری( ١٤ ) ئەو شتانە چین كە ڕۆژوو بەتـاڵ دەكەنەوە؟

١- خواردن و خواردنەوە ئەگەر بە ئەنقەست بوو

٢- گەشـتنی شـتێكی مـاددی بـۆ نـاوەوەی لـەش لـە دەرچـەیەكی كراوە(مەبەست لە دەرچەیەكی كراوە واتە دەم و گویٚ و پێش و پاش لە نێر و میٚ دا

٣- رشانەوە بە دەسـت ئەنقەسـت بـەلاَم رشـانەوە زۆری بـۆ هێنـاو رشایەوە ئەوە زیانی نیە بۆ ڕۆژووەكەی.

٤- جوتبونی بە ئەنقەست هەرچەندە ئاویشی نەیەتەوە(جیماع)

٥- ئاو هێنانەوە (الاســـتمناء) بـەلاَم ئەگـەر بەسـەریدا هـاتبوو، بـە دەستی ئەم نەبوو ،ئەوە ڕۆژووی ناشكیٚ وەك بە خەیاڵ یـان لـە خۆڕا ئاوەكە هاتە خوارەوە.

٦- سورِی مانگانە و خوێنی منداڵ بوون

٧- شێتی و هەڵگەڕانەوە لە دین

٨- چڵم یان بەڵغەم بگاتە بۆشایی دەمی و توانای هەبێ فڕێ ی بداتە دەرەوە ،لەگەڵ ئەوەشدا قوتی داوە ئەوە ڕۆژوەکەی بەتاڵ دەبێ،بەلاّم ئەگەر توانای فرێدانی نەبوو بە خۆی ڕۆیشتە خوارەوە ئەو کاتە ڕۆژوەکەی بەتاڵ نابێ

<u>تێبینی</u>: لە مەزهەبی ئیمامی (حنفی)دا بە قوتدانەوەی چڵم و بەڵغەمی خۆی ڕۆژوو ناشکێنێ.

٩-(بخاع) دەرمانی (ڕەبۆ) ئەو دەرمانەیە لە ناو قوتیدا لەگەڵ هەوا دادەگیرێ نەخۆشە پشو تەنگەکان بە کاری دێنن ڕۆژوو دەشکێنێ ( <u>بەلاّم هەندێ لە زانایان فەتوایان داوە ڕۆژو ناشکێنێت</u>).

## پرسیاری( ١٥ ) ئەو عوزرانەی ڕۆژوو شکاندن حەلاڵ دەکەن چین؟

١-نەخۆشییێك کە زیانی زۆر بە کەسەکە بگەیەنێت یان ئازارێکی زۆری بدات.

٢-سەفەرێکی دوور کە کەمتر نەبێت لە (٨٣)کم و وە سەفەرەکەش حەلاڵ بێت. وە خوای گەورە دەفەرموێت ((فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضاً أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ))البقرة ١٨٤

واتە: ئەوەش کە نەخۆش بێت یان لە سەفەردا بێت با لە ڕۆژانی تردا بەو ئەندازە بیگرێتەوە.ئەم دووانە فیدیە نادەن بەڵام ڕۆژووەکان دەگێڕنەوە

٣-نەبوونی توانای ڕۆژووگرتن: ئەوەی ناتوانێت بە ڕۆژوو بێت لەبەر پیری یان نەخۆشییێك کە ئومێدی چاك بوونەوەی نیە ئەوە واجب نیە لەسەری بەڕۆژوو بێت بەڵکو بۆ هەر ڕۆژێك (فیدیە)دەدات و ڕۆژوو گێڕانەوەی لە سەر نیە.

## پرسیاری (١٦) ئایا رۆژو چەند جۆرە ؟

وەلام : رۆژوو چوار جۆرە

١-رۆژووی فەرز وەك ا-رۆژووی مانگی رەمەزان ب--رۆژووی کەفارەت ج- رۆژووی نەزر

٢-رۆژووی سوننەت وەك دووشەم و پێنج شەم و١٣-١٤-١٥ هەموو مانگێك وعەرەف ،،،،،هتد

٣- رۆژووی حەرام ا-دوو رۆژی چەژنی رەمەزان و قوربان (عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ : أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ)نَهَى عَنْ صِيَامِ يَوْمَيْنِ يَوْمِ الأَضْحَى ، وَيَوْمِ الْفِطْرِ. رَوَاهُ مُسْلِمٌ ، وأَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ واتە :پێغەمبەر (ﷺ)قەدەغەی کردوە :لە چەژنی قوربان و رەمەزاندا بە رۆژوو ببیٚ.

)ب-(ايام التشريق)سێ ڕۆژەکەی دوای چەژنی قوربان (أَيَّامُ التَّشْرِيقِ أَيَّامُ أَكْلٍ وَشُرْبٍ وَذِكْرِ اللَّهِ. رَوَاهُ مُسْلِمٌ واتە :سێ ڕۆژەکەی (أَيَّامُ التَّشْرِيقِ) ی دوای چەژنی قوربان ڕۆژانی خواردن و خواردنەوە وزکری خوای گەورەنە.

)ج- (يوم الشك بلا سبب) ڕۆژی گومان بێ هۆ ،وەك ٣٠ شەعبان (كُنَّا عِنْدَ عَمَّارِ بْنِ يَاسِرٍ فَأُتِيَ بِشَاةٍ مَصْلِيَّةٍ فَقَالَ : كُلُوا فَتَنَحَّى بَعْضُ الْقَوْمِ فَقَالَ : إِنِّي صَائِمٌ فَقَالَ عَمَّارٌ : مَنْ صَامَ يَوْمَ الشَّكِّ فَقَدْ عَصَى أَبَا الْقَاسِمِ (ﷺ) أَخْرَجَ الْبُخَارِيُّ . (واتە: عەممار وتی هەرکەسێك لە ڕۆژی بە گوماندا بە ڕۆژوو بێ بەراستی تاوانی بەرامبەر پێغەمبەر کردوە.

<u>بۆ زانیاری</u> : زانایان دەڵێن دورستە ڕۆژووە سوننەتەکان لەڕۆژی گومان بگرێ بەبەڵگەی : عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ - رضي الله عنه - قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (ﷺ)لَا تَقَدَّمُوا رَمَضَانَ بِصَوْمِ يَوْمٍ وَلَا يَوْمَيْنِ، إِلَّا رَجُلٌ كَانَ يَصُومُ صَوْمًا، فَلْيَصُمْهُ - مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ . واتە: وەپێش ڕەمەزان مەکەوەن بەبە ڕۆژوو بونی ڕۆژێك یان دوو ڕۆژ تەنها ئەو کەس نەبێ کە بە عادەتی خۆی بە ڕۆژوو دەبێ.

).د-ڕۆژووی سەرتاسەری ساڵ : ئەمەش بەڵگەکانیان لە خوارەوە.

٤- ڕۆژووی ناپەسند (مکروه) ا-ڕۆژی هەینی بە تەنها (عَنْ أَبِـي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ)قَالَ : لاَ تَخْتَصُّوا لَيْلَةَ الْجُمُعَةِ بِقِيَامٍ مِـنْ بَـيْنِ اللَّيَالِي ، وَلاَ تَخْتَصُّوا يَوْمَ الْجُمُعَةِ بِصِيَامٍ مِنْ بَيْنِ الأَيَّامِ إِلاَّ أَنْ يَكُونَ فِي صَوْمٍ يَصُومُهُ أَحَدُكُمْ. رَوَاهُ مُسْلِمٌ. واتە : بەتایبەتی لەڕۆژی هەینی بە ڕۆژوو مەبن ، مەگەر لە ڕۆژێکی واها دابێ،بەعادەت یەکێکتان بە ڕۆژوو دەبوو.

)ب-شەممە بەتەنها ج-سەرتاسەری ساڵ .

عَمْرو بْنِ الْعَاصِ، قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ (ﷺ): يَا عَبْدَ اللهِ أَلَـمْ أُخْبَرْ أَنَّكَ تَصُومُ النَّهَارَ وَتَقُومُ اللَّيْلَ فَقُلْتُ: بَلَى يَا رَسُولَ اللهِ قَالَ: فَـلاَ تَفْعَلْ، صُمْ وَأَفْطِرْ، وَقُمْ وَنَمْ، فَإِنَّ لِجَسَدِكَ عَلَيْكَ حَقًّـا، وَإِنَّ لِعَيْنِـكَ عَلَيْكَ حَقًّا، وَإِنَّ لِزَوْجِكَ عَلَيْكَ حَقًّا، وَإِنَّ لِزَوْرِكَ عَلَيْـكَ حَقًّـا، وَإِنَّ بِحَسْبِكَ أَنْ تَصُومَ كُلَّ شَهْرٍ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ، فَإِنَّ لَكَ بِكُـلِّ حَسَـنَةٍ عَشْـرَ أَمْثَالِهَا، فَإِنَّ ذَلِكَ صِيَامُ الدَّهْرِ كُلِّهِ فَشَدَّدْتُ فَشُدِّدَ عَلَيَّ، قُلْـتُ: يَـا رَسُولَ اللهِ إِنِّي أَجِدُ قُوَّةً قَالَ: فَصُمْ صِيَامَ نَبِيِّ اللهِ دَاوُدَ عَلَيْهِ السَّلاَمُ، وَلاَ تَزِدْ عَلَيْهِ قُلْتُ: وَمَا كَانَ صِيَامُ نَبِيِّ اللهِ دَاوُدَ عَلَيْهِ السَّلاَمُ قَالَ: نِصْـفُ الدَّهْرِ، فَكَانَ عَبْدُ اللهِ يَقُولُ بَعْدَمَا كَبِرَ: يَا لَيْتَنِي قَبِلْتُ رُخْصَـةَ النَّبِـيِّ (ﷺ) .أخرجه البخاري

واتـە: هەنـدێ جـار بـە ڕۆژوو ببـەو هەنـدێ جـاریش پـێ مەبە،شەونوێژ بکەو بخەوە،لاشەی خۆت مافێکی لەسەر تۆ هەیە،

چـاوەکانت مـافێکی لەسـەر تـۆ هەیە،ژنەکـەت مـافێکی لەسـەر تـۆ هەیە،میوانەکەت مافێکی لەسەر تۆ هەیە.

## پرسیاری( ١٧ )ئەگەر کەسێك لەرەمەزاندا جیمـاع بکـات بەئەنقەسـت کەفارەتی چیە؟

وەلام: کەفارەتی بەم شێوەی خوارەوەیە .

١-یان بەندەیەك ئازاد بکات ، لە سەردەمە نەماوە.

٢-ئەگەر بەندەنەبوو(٦٠)رۆژ لەسەریەك بەرۆژوو بێت

٣-ئەکەر توانای نەبوو بەرۆژوبێت(٦٠)فەقیرنان بدات

## پرسیار( ١٨ )ئایا کەفارەتی جیماع لەسەر پیـاوە یـان لەسـەر ژن و پیاوە؟

وەڵام : مەزهەبی شافعی لەمەدا ئەوەیـە کـەفارەت لەسـەر ژن نیـە بـەهیچ جۆرێك،نەلەحالەتێکـدا خـۆی رازی بێت،نەلەحالەتێکـدا زۆری لێکرابێت،بەڵکو تەنها گرتنەوەی رۆژی لەسەرە و بەس.

**پرسیاری ( ۱۹ ) ئایا چار چیە بۆ ئەو وڵاتانەی رۆژیان زۆر تێدادرێژە شەویان کورتە؟**

وەڵام : لەسـەر ئـەو وڵاتانـە دەڕۆن (قیـاس) دەکرێـت کەشـەو و ڕۆژیـان ناوەنـدە و شـەریعەتی ئیسلامی تێـدا هاتۆتـە خـوارەوە وەك مەککە و مەدینە.

**پرسیاری ( ۲۰ )لە چ کاتێك دەتوانی نیەتی رۆژوو بێنیت؟**

وەڵام : لە شەو لەڕۆژ ئاوابوون تاکو بەیانی.

**پرسیاری( ۲۱ ) ئایا رۆژوو بەزۆر لێکردن دەشکێ؟**

وەڵام : ئەگـەر بـە زۆری دەمـی بکەنـەوە شـتێکی بڕژێننـە نـاو گەرووی ڕۆژووەکەی ناشکێ.

**پرسیاری( ۲۲ )ئەگەر کەسێك بێ هۆش بوو ئایا رۆژوەکە دەشکێ؟**

وەڵام : بێ هـۆش بـوون زیـان لـە ڕۆژوو نـادات ،بـەو مەرجـەی لـە ڕۆژووەکەدا دەمێکی کەم بەهۆش بێتەوە ،بەڵام ئەگـەر لـە بەیانیـەوە تـا ڕۆژئـاوابوون بـێ هـۆش بوبێ،ڕۆژووەکـەی بەتاڵـە واجبـە قـەزای بکاتەوە، وە دەرمـانی بـێ هۆشـکەریش (بـەنج) هـەمان بڕیـاری بـۆ دەدرێ ئەگەر بۆ کارێکی پێویست بەکار هێنرا.

## پرسیاری( ۲۳ )ئایا دروستە خواردن و خواردنەوە بدرێتە کەسانی بێ ڕۆژوو؟

وەڵام: حەرامە موسڵمان لە ڕۆژانی ڕەمەزاندا خواردن و خواردنەوە بداتە ئەو کەسانەی ڕۆژوویان لەسەر واجبە و کە بە بێ عوزر بە ڕۆژوو نابن.وە ئەگەر ڕۆژوو نەگرەکە کافریش بێت دروست نیە خواردن و خواردنەوەی بداتێ ،چونکە ئەمە یارمەتی دانە لەسەر گوناهکاری.

## پرسیاری( ۲٤ ) ئایا دروستە ( مجاهد )ی ڕێگا خوا لە شەری کافران ڕۆژوو بشکێنێ؟

وەڵام : ئەگەر موسڵمانان بە هۆی بە ڕۆژووبون توانای بەرگریان نەبوو،دروستە ڕۆژوو بشکێنن،بەڵکو ئەگەر مەترسی سەرکەوتنی کافرەکان هەبێ ئەو کاتە واجبەڕۆژووەکان بشکێنن،بۆ نموونە: عـنأَنَسٍ رضي الله عنه، قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ)أَكْثَرُنَا ظِلاً الَّذِي يَسْتَظِلُّ بِكِسَائِهِ؛ وَأَمَّا الَّذِينَ صَامُوا فَلَمْ يَعْمَلُوا شَيْئًا، وَأَمَّا الَّذِينَ أَفْطَرُوا فَبَعَثُوا الرِّكَابَ وامْتَهَنُوا وَعَالَجُوا؛ فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ) ذَهَبَ الْمُفْطِرُونَ الْيَوْمَ بِالأَجْرِ)(رواه الشيخان) واتە:پێغەمبەر (ﷺ) و (صحابە)کان لە سەفەرێکی غەزادا بوون،هەندێکیان ڕۆژوویان شکاند و بە هێز بوون و کاری پێویستیان کرد،هەندێکیشیان بە ڕۆژووبون و بۆ هەندێ کاری

پێویست بێ هێزبوون ،پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی ڕۆژووشکێنەکان ئەمڕۆ پاداشتی گەورەیان بۆ خۆیان برد.

## پرسیاری( ٢٥ ) ئەگەر بە زۆری جیماعیان لەگەڵ کەسێك کرد،یان لەبیری نەبوو بە ڕۆژووە،ئایا ڕۆژووی دەشکێ؟

وەڵام : ئەگەر نەیدەزانی جیماع لە ڕۆژوودا حەرامە،چونکە تازە موسڵمان ببوو،یان لە شوێنێکی دوور لە زانایان گەورە ببو یان لە بیری چووبێ کە بە ڕۆژووە ،یان بە ویستی خۆی نەبێ وەك بە زۆر لێکردن جیماعیان لەگەڵ کردبێ یان لە خەو دا جیماعیان لەگەڵ کردبێ لەو حاڵەتانەدا ڕۆژوویان بەتاڵ نابێ ،بەڵام ڕۆژووی بە ئاگایەکە بە تاڵ دەبێ.

## پرسیاری( ٢٦ ) ئایا نوێژی تراویح سوننەتە یان نا؟

وەڵام : نوێژی تەراویح سوننەتە،ئیمامی بوخاری و موسلیم ریوایەتیان کردوە لە حەزرەتی عائیشەوە کە پێغەمبەر(ﷺ)چەند شەوێ لە ماڵ هاتە دەرەوە بۆ مزگەوت و هەشت رکات نوێژی تەراویحی کردو لە هەردوو رکاتێکدا سەلامی دەدایەوە ئیتر خەڵکەکە زۆر بوون لە شەوی چوارەم نەهاتە دەرەوە ،عەرزیان کرد بۆچی نەهاتۆتە دەرەوە فەرمووی ؟ :ترسام فەرزبکرێت لەسەرتان و نەتوانن بەجێ ی بهێنن.

(قَالَتْ عَائِشَةُ خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ)لَيْلَةً مِنْ جَوْفِ اللَّيْلِ فَصَلَّى فِي الْمَسْجِدِ فَثَابَ رِجَالٌ فَصَلَّوْا مَعَهُ بِصَلَاتِهِ فَلَمَّا أَصْبَحَ النَّاسُ تَحَدَّثُوا أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَدْ خَرَجَ فَصَلَّى فِي الْمَسْجِدِ مِنْ جَوْفِ اللَّيْلِ فَاجْتَمَعَ اللَّيْلَةَ الْمُقْبِلَةَ أَكْثَرُ مِنْهُمْ قَالَتْ فَخَرَجَ النَّبِيُّ (ﷺ)اغْتَسَلَ مِنْ جَوْفِ اللَّيْلِ فَصَلَّى وَصَلَّوْا مَعَهُ بِصَلَاتِهِ ثُمَّ أَصْبَحَ فَتَحَدَّثُوا بِذَلِكَ فَاجْتَمَعَ اللَّيْلَةَ الثَّالِثَةَ نَاسٌ كَثِيرٌ حَتَّى كَثُرَ أَهْلُ الْمَسْجِدِ قَالَتْ فَخَرَجَ النَّبِيُّ (ﷺ)مِنْ جَوْفِ اللَّيْلِ فَصَلَّى فَصَلَّوْا مَعَهُ فَلَمَّا كَانَتْ اللَّيْلَةُ الرَّابِعَةُ اجْتَمَعَ النَّاسُ حَتَّى كَادَ الْمَسْجِدُ يَعْجَزُ عَنْ أَهْلِهِ فَجَلَسَ النَّبِيُّ (ﷺ)فَلَمْ يَخْرُجْ قَالَتْ حَتَّى سَمِعْتُ نَاسًا مِنْهُمْ يَقُولُونَ الصَّلَاةَ فَلَمْ يَخْرُجْ إِلَيْهِمْ النَّبِيُّ (ﷺ)فَلَمَّا صَلَّى صَلَاةَ الْفَجْرِ سَلَّمَ ثُمَّ قَامَ فِي النَّاسِ فَتَشَهَّدَ ثُمَّ قَالَ أَمَّا بَعْدُ فَإِنَّهُ لَمْ يَخْفَ عَلَيَّ شَأْنُكُمْ اللَّيْلَةَ وَلَكِنِّي خَشِيتُ أَنْ تُفْرَضَ عَلَيْكُمْ فَتَعْجَزُوا عَنْهَا) مسند أحمد) ، وە هەروەها وارد بووە لە هەندێ سەرچاوان کە ١٢ رکاتی تریشی لە ماڵ کردوە واتە ٨+١٢=٢٠ وە هەروەها ئەهلی مەدینە بۆیان هەیە ٣٦ رکات بکەن جگە لە(وتر) واتە ئێستا بەزۆری بەم شێوەیەیە:

١-لە کوردستان (٨) رکات تەراویح وە (٣) رکات وتر) =١١ رکات

٢-لە مەککە (٢٠) رکات تەراویح وە (٣) رکات وتر) =٢٣ رکات

٣-بەڵام خەڵکی مەدینە بۆیان هەیە(٣٦) رکات تەراویح بکەن جگە لە وترەکان

## پرسیاری( ۲۷ ) پاش وەفاتی پێغەمبەر( ﷺ ) کێ بەم شێوەی ئێستای نوێژی تەراویحی ڕێك خست؟

وەڵام : ئیمامی عومەر بوو ،خوای لێ ڕازی بێ دوو ئیمامی بۆ موسڵمانان دانا وە تەوحیدی نوێژەکانی کرد.ئوبەیی کوری کەعبی کرد بە ئیمام بۆ پیاوان وە سولەیمانی کوری حەنتەمەی بە ئیمامی ژنان دانا وە هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ)هەموو ڕازی بوون وە کەسیش ئینکاری نەکرد.

## پرسیاری( ۲۸ ) ئایا زەکاتی سەرفترە واجبە؟وە کەی دەدرێ؟

وەڵام : زەکاتی سەرفترە فەرزە لە سەر هەموو موسڵمانێك گەورەو بچووك کە زیاد لە قوتی شەو و ڕۆژی جەژنی هەبێت.لە سونەنی ابو داود هاتووە((عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ فَرَضَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) زَكَاةَ الْفِطْرِ طُهْرَةً لِلصَّائِمِ مِنْ اللَّغْوِ وَالرَّفَثِ وَطُعْمَةً لِلْمَسَاكِينِ فَمَنْ أَدَّاهَا قَبْلَ الصَّلَاةِ فَهِيَ زَكَاةٌ مَقْبُولَةٌ وَمَنْ أَدَّاهَا بَعْدَ الصَّلَاةِ فَهِيَ صَدَقَةٌ مِنْ الصَّدَقَاتِ) واتە: پێغەمبەر(ﷺ) زەکاتی سەر فترەی فەرز کردوە ، بۆ پاك بونەوەی ڕۆژوەوان ،لە قسەی ناشرین و بێ شەرعی ،وە خواردنێ بێ بۆ هەژاران هەرکەسێ پێش نوێژی جەژن بیدا ئەوا زەکاتێکی وەرگیراوە وە هەر کەسێ دوایی نوێژ بیدا ئەوە خێرێکە لە خێرەکان.

**پرسیاری( ۲۹ ) کەی سەرفترە واجب دەبێ؟**

وەڵام : بە هاتنی شەوی جەژنی ڕەمەزان واجب دەبێ. **بەڵام دورستە لە سەرەتای مانگی رەمەزانەوە سەرفترە بدرێ.**

**پرسیاری( ۳۰ )ئایا کەی فیدیەی رۆژوو دەدرێت؟**

وەڵام : لە مەزهەبی ئیمامی شافعی واجبە لە کۆتایی رەمەزاندا فیدیە بدرێت،دروستیشە لە شەوێکدا فیدیەی رۆژووە سبەینێ بدرێ بەڵام لە مەزهەبی ئیمامی ئەبو حەنیفە دروستە لە سەرەتای رەمەزاندا فیدیەی هەموو رەمەزان بدات.

**پرسیاری( ۳۱ )بۆچی خەڵك لە رەمەزان زەکات دەدات؟**

وڵام: مرۆڤی موسڵمان دەتوانێ لە هەموو کاتێکی ساڵ زەکات بدات کە ئەم دوو مەرجەی لێ هاتە جێ:

١- کە ماڵەکە گەیشتە ئەندازەی زەکات

٢- ساڵی بەسەردا سوڕایەوە.

بەڵام بۆیە خەڵك لە رەمەزان زەکات دەدەن لەبەر دوو هۆ:

١-لەم مانگەدا حیساب بۆ خۆی ڕادەگرێ واتە رەمەزان بۆ رەمەزان.

۲-چونکە خێر لە ڕەمەزاندا بە چەندین قاتەو پاداشتی زۆر زیاترە. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ قِيلَ : يَا رَسُولَ اللَّهِ فَأَيُّ الصَّدَقَةِ أَفْضَلُ؟ قَالَ :« صَدَقَةٌ فِي رَمَضَانَ»(الترمذي:٦٦٣) واتە ئەنەس خوا لی رازی بێ ووتی :وتیان ئەی پێغەمبەری خوا باشترین خێر کامەیە؟ فەرمووی خێر لە رەمەزان.

## پرسیاری (۳۲)بۆچی خەڵك ئێواران خواردن و خواردنەوە دەباتە مزگەوتەکان بۆ خەڵکی بە رۆژوو یان کەسانێك هەن نان ئامادە دەکەن لە ماڵان و شوێنی تر؟

وەڵام : چونکە زۆر خێرە لە کاتی فەتاردا رۆژووگرەکان بە خواردن تێر بکات ،جا ئەگەر دەسەڵاتی نەبوو با بەربانگ بداتە رۆژووگرەکان هەرچەندە تەنها قومە ئاوێك یان دانە قەسپێك بێت.چونکە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت(قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) مَنْ فَطَّرَ صَائِمًا كَانَ لَهُ مِثْلُ أَجْرِهِ غَيْرَ أَنَّهُ لَا يَنْقُصُ مِنْ أَجْرِ الصَّائِمِ شَيْئًا) احمد ، والدارمی ، والترمذی - حسن صحيح - وابن ماجه ، وابن خزيمة ، وابن حبان ، والبيهقی ،واتە:هەرکەسێك بەربانگ بداتە رۆژوو گرێت وەك رۆژووگرەکە خێری بۆ دەنوسرێ،هیچیش لە خێری رۆژووگرەکە کەم ناکاتەوە.

**پرسیاری (٣٣) ئەگەر کەسێك شێتکی خوارد یا خواردیەوە یا جیماعی کرد وای زانی ڕۆژ ئاوابووە یاوای ئەزانی ڕۆژ نەبۆتەوە دوایی پێچەوانەی ئەوە دەرکەوت؟**

وەڵام : دوو ڕا هەیە یەکەم : دەڵێ ئەوکەسە قەزای لەسەرە لای جەماوەری زانایان ،لەوانە هەرچوار ئیمامە خاوەن مەزهەبەکانن .
دووەم :(ئیسحاق و داود و ئیبنوحزم و عەتا و عوروە و حەسەنی بەسری و موجاهید دەڵێن ئەو کەسە ڕۆژووەکەی دورستە و گێرانەوەی لەسەر نی یە ، بەپێی فەرموودەی خوای گەورە ﴿وَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ فِيمَا أَخْطَأْتُم بِهِ وَلَٰكِن مَّا تَعَمَّدَتْ قُلُوبُكُمْ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ (الأحزاب ٥) واتە: لەسەر ئەوانەی بەهەڵە ئەیکەن تاوانبار نابن،بەڵام لەسەر ئەوانەی بە قەستی دڵ ئەیان کەن تاوان بار ئەبن . وەبەپێی فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) کەفەرموویەتی : (إِنَّ اللَّهَ وَضَعَ عَنْ أُمَّتِي الْخَطَأَ وَالنِّسْيَانَ وَمَا اسْتُكْرِهُوا عَلَيْهِ) (رواه أبن ماجه و الطبراني والحاكم) واتە خوا تاوانی هەڵەکردن و لەبیر چونەوە و بە زۆر پێکردنی لەسەر ئوممەتەکەم هەڵگرتووە.

## پرسیاری( ٣٤ )بەڵگەی شەوی قەدر چی یە ؟ و ەپاداشتی چیە؟

وەڵام: خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا سورەتێکی بە ناوی قەدر دابەزاندوە وەك دەفەرموێت.

بِّسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ فِي لَيْلَةِ ٱلْقَدْرِ ١

خـودای بـەرزی بـێ وێنـە دەفـەرموێت: بێگومـان ئێمـە قورئـانی پیرۆزمان لە شەوی (قەدر) دا ناردە خوارەوە، واتە دەستپێکردن بـە ناردنـە خـوارەوەی قورئـان لـە شـەوی (قـەدر) دا بـووە، نـەك ناردنـە خوارەوەی هەموو قورئان بە گشتیی... هەندێك لە زانایان ڕایـان وایـە کـە خـودا هـەموو قورئـانی لـە ( لـەوحی مـەحفوڤ) ەوە نـاردووە بـۆ ئاسمـانی یەکـەم، ئینجـا لـەوێوە وورده وورده (جبرائیـل) _سـەلامی خـودای لەسـەر بێـت_ هـەر جـارەو چـەند ئایـەتێکی لـێ هێناوەتـە خوارەوە بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ) تا بە نزیکەی بیست و سێ سـاڵ هەموو قورئان هاتوەتە خوارەوە... ئەو زانایانە دەڵێن ئەم قسانە لـە (ئـیبن عـەبباس) ەوە وەرگـیراوە، بـەڵام مـن وا دەزانم ئەمـە جێگـەی گومانــە کــە (ئـیبن عـەبباس) وای وتبێـت، چـونکە لـە سـەردەمی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) زۆرجار ڕووداوێك ڕوویداوە، یان پرسیارێك لـە پێغەمبـەر(ﷺ) کـراوە سـەبارەت بـە شـتێك کـە پێویسـتیی بـە ڕوونکردنـەوەو ڕێنمـایی هـەبووە، خـودای گـەورەیش یەکسـەر چـەند ئایەتێکی ناردوەتە خوارەوە بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو کارانە، یـاخود بـۆ

وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانەی کە دەکران. شەوی (قەدر) شەوێکە لە شەوەکانی مانگی ڕەمەزان، خودا قەدرو ڕێزێکی تایبەتی پێداوە کە قەدرو ڕێزی وای بەهیچ شەوێکی تری ساڵ نەبەخشیوە، چونکە لەو شەوەدا خودا لوتف و بەزەیی خۆی ڕژاند بەسەر مرۆڤایەتیداو نووری هیدایەتی خۆی بۆ ناردنە خوارەوە، کە چەند ئایەتێك بوو لە قورئانی پیرۆز. شەوی قەدر شەوێکە لە شەوەکانی مانگی ڕەمەزان، چونکە خودا دەفەرموێت: شهر رمضان الذی أنزل فیه القرآن... بەڵام کام شەوەی ڕەمەزانە؟. هەندێك دەڵێن یەکێکە لە دە شەوەی کۆتایی مانگەکە، هەندێکی تر دەڵێن: شەوی بیست و حەوتەمینیەتی، هەندێکی دیکە دەڵێن: شەوی بیست و یەکەمیەتی، هەروەها ڕایەکی تریش هەیە کە شەوێکە لە شەوەکانی مانگەکە بە گشتی، بەڵام بەبێ دیاریکردنی ژمارەی شەوەکە، ئەمە جگە لە چەندین ڕای تر...

وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا لَيۡلَةُ ٱلۡقَدۡرِ ٢

سەبارەت بە گەورەیی و بەڕێزیی ئەو شەوە پیرۆزە، خودا دەفەرموێت: ئەی پێغەمبەر(ﷺ) ئایا تۆ چوزانیت کە شەوی (قەدر) چ شەوێکی گەورەو بە قەدرە؟.

لَيۡلَةُ ٱلۡقَدۡرِ خَيۡرٞ مِّنۡ أَلۡفِ شَهۡرٖ ٣

شەوی قەدر لە ماوەی هەزار مانگ بە نرخترەو خێرو بەرەکەتی زیاترە، واتە: بەسەربردنی ئەو شەوە بە کردەوەی چاك و بە خواپەرستیی و نوێژو قورئان خوێندن، خێری زیاترە لە خێری ئەو

کردەوانە لە ماوەی هەزار مانگدا ئەنجام بدرێن، کە (لیلە القدر) یان تیادا نەبێت.

تَنَزَّلُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِم مِّن كُلِّ أَمْرٍ ﴿٤﴾

تەفسیری ئایەتی ٤، ٥ بە یەکەوەیە، کە دەفەرموێت: لەو شەوەدا مەلائیکەکان و جبرائیل بۆ ئەنجامدانی هەر کارێك کە خودا بڕیاری لەسەر دابێت، دێنە خوارەوە... ئەو شەوە هەر لە ئێوارەوە تا گزنگی بەیان هەڵدێت_ کە ئیتر نوێژی بەیانی دەست پێدەکات_ بەردەوام سڵاوو خێرو بەرەکەت دەبارێت.

سَلَٰمٌ هِيَ حَتَّىٰ مَطْلَعِ ٱلْفَجْرِ ٥

زانایان دەفەرمون شەوی قەدر چاکترین شەوە لە درێژای ساڵ.

## پرسیاری (٣٥) ڕای زانایان چیە لە دیاریکردنی ئەم شەوە؟

وەڵام: زانایان ڕایان زۆرە بۆ دیاری کردنی ئەم شەوە

١-هەیانە دەڵێ شەوی قەدر لە هەموو مانگەکەدا هەیە

٢-هەیانە دەڵێ ئەم شەوە شەوی (٢١)ە

٣- هەیانە دەڵێ ئەم شەوە شەوی (٢٣)ە

٤- هەیانە دەڵێ ئەم شەوە شەوی (٢٥)ە

٥- هەیانە دەڵێ ئەم شەوە شەوی (٢٩)ە

٦-هەیانە ڕای وایە ئەو شەوە ئەگەڕێت بە شەوە تاکەکانەوە لە دە شەوی ئەخیری

٧-بـەڵام بەشــی زۆری زانایـان لەســەر ئـەوە هـاوڕان کـە شـەوی (٢٧)ە

شەو نوێژکردن و خواپەرستی و پاڕانـەوە و قورئـان خوێنـدن لـەو شەوە دا زۆرخێرە. بوخاری و موسلیم لە ئـەبو هـوریرەوە ئەگێرنـەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویـەتی- ١- (عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّـهِ (ﷺ) مَنْ قَامَ لَيْلَةَ الْقَدْرِ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَـدَّمَ مِـنْ ذَنْبِـهِ، **وەهەروەها فەرمویەتی** -٢- وَمَنْ صَامَ رَمَضَانَ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ. رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ و مُسْلِمٌ) واتـە هـەر کـەس لـە شـەوی قەدردا نەخەوت و خوا پەرستی کرد بە باوەرەوە و لەبـەر ڕەزامەنـدی خـوا ،وە چـاوەروانی ئـەو پاداشـتەی لـە خـوا کرد،خـوای گـەورە لـە گوناهی لەوەو پێشی خـۆش ئـەبێت. وە هـەر کـەس لـە ڕەمـەزان بـە ڕۆژوو بوو بە باوەرەوە و لەبەر ڕەزامەنـدی خـوا ،وە چـاوەروانی ئـەو پاداشتەی لە خوا کرد،خوای گەورە لە گونـاهی لـەوەو پێشـی خـۆش ئەبێت.

**پرسیاری( ٣٦ ) چ دوعایەك زۆر خێرە لەم شەوەدا؟**

وەڵام : لە عائیشـەوە ئەگێرنـەوە : (عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اَللَّـهُ عَنْهَـا قَالَتْ: - قُلْتُ يَا رَسُولَ اَللَّهِ : أَرَأَيْتَ إِنْ عَلِمْتُ أَيَّ لَيْلَةٍ لَيْلَةُ الْقَدْرِ، مَا أَقُولُ فِيهَا؟ قَالَ: " قُولِي: اَللَّهُمَّ إِنَّكَ عَفُوٌّ تُحِبُّ اَلْعَفْوَ فَاعْفُ عَـنِّيرَوَاهُ

عيلى

اَلْخَمْسَةُ، غَيْرَ أَبِي دَاوُدَ، وَصَحَّحَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ، وَالْحَاكِمُ)) واته فه‌رمويه‌تى ووتم ئه‌ى نێراوى خوا ئه‌گه‌ر زانيم شه‌وى قه‌دره چ دوعايه‌ك بڵێم تێدا؟فه‌رموى بڵێ خوايه تۆ زۆر لێبورده‌ريت و لێبوردنت پێ خۆشه‌جا لێم ببوره.

## پرسيارى ( ٣٧ )ئايا ره‌مه‌زان په‌رسته‌كان كێن؟

وه‌ڵام : ئه‌و جۆره كه‌سانه‌ن كه ره‌مه‌زان دێت ده‌ست ده‌كه‌ن به نوێژكردن و به‌رۆژوو بوون و خۆداپۆشين ،به‌ڵام كه ره‌مه‌زان ته‌واو بوو واز له نوێژ دێنن پشت له‌مزگه‌وت ده‌كه‌ن و ئافره‌تانيش له‌چك (سه‌رپۆش)فرێ ده‌ده‌ن ، وه مه‌ى خۆر ده‌ست ده‌كاته‌وه به‌مه‌ى خواردنه‌وه،ئه‌مانه ره‌مه‌زان په‌رستن نه‌ك خودا په‌رستن چونكه خوا له‌هه‌ر (١٢)مانگى ساڵ فه‌رمانى كارى چاكمان پێ ده‌كات ،

ئه‌و جۆره كه‌سانه نه‌فسى خۆيان كردۆته خواى خۆيان.وه خواى گه‌وره له قورئانى پيرۆزدا له سوره‌تى(الجاثية)ئايه‌تى (٢٣) ده‌فه‌رموێت((أَفَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ وَأَضَلَّهُ ٱللَّهُ عَلَىٰ عِلْمٍ وَخَتَمَ عَلَىٰ سَمْعِهِۦ وَقَلْبِهِۦ وَجَعَلَ عَلَىٰ بَصَرِهِۦ غِشَٰوَةً فَمَن يَهْدِيهِ مِنۢ بَعْدِ ٱللَّهِ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ٢٣

واته:ئاخۆ بينيوته ئه‌و كه‌سه‌ى هه‌واو ئاره‌زووى خۆى كردۆته په‌رستراوى خۆى خواش به زانايى گومراى كرد وه مۆرى ناوه به‌سه‌ر گوێ و دڵيدا وه په‌رده‌ى داوه به‌سه‌ر چاويدا ده‌ى جگه له خوا كێ

ڕێنموونیی دەکات، دەی بۆچی بیرناکەنەوە. ؟ وەئێمە بەو خوشك و برایانە مادام لە رەمەزان زاڵ بووی بەسەر نەفس و شەیتان ، نەهێڵی دوای رەمەزان ئەوان بەسەردا زاڵ بن.

## پرسیاری ( ٣٨ ) ئەگەر چوویتە مزگەوت لە رەمەزان دەست بە تەراویح کرابوو تۆش نوێژی عیشات نەکردبوو چی دەکەی؟

وەڵام / دەست بە نوێژی تەراویح دەکەی لەگەل نوێژ خوێنان بە نیەتی نوێژی عیشا، دوایی سەلام دانەوەی ئیمام ، تۆ سەلام نادەیتەوە نویژەکەت تەواو دەکەیت ، ئنجا دوایی لەگەڵ خەڵك تەراویح بکە .

## پرسیاری ( ٣٩ ) ئایا دروستە ئافرەت دەرمان بخوات تاکو حەیزی دوا بکەویت بۆ ئەوەی رەمەزان بە تەواوی بگرێت ؟

وەڵام / بەڵێ دورستە بە مەرجێك ڕاوێژ بە دکتۆری پسپۆر و دیندار بکات، بەڵام ئەگەر دکتۆرەکە ووتی زیانت پێ دەگات، ئەوا دورست نیە چونکە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێ (لَا ضَرَرَ وَلَا ضِرَارَ) رَوَاهُ أَحْمَدُ، وَابْنُ مَاجَةْ .واتە موسڵمان نابێ زیان نە لەخۆی نە لە خەڵکی بدات.

**پرسیاری (٤٠) کەسێکی بە رۆژوو لە بیری چوو شتی خوارد ئایا رۆژوو وەکەی دەشکێ ، وەئەگەر کەسێك دیتی بیری بخاتەوە یان وازی لیبێنێ ؟**

وەڵام / وادیارە لەبیر چوون لە سروشتی مرۆڤە و لە ویستی ئەو بەدەرە، شەریعەت ئاسانی کردووە و ئەرك ناخاتە سەر لەبیرچوون ، بۆیە رۆژوو وەکەی ناشکێ ، وەك پێغەمبەر دەفەرموێت (مَنْ نَسِيَ وَهُوَ صَائِمٌ، فَأَكَلَ أَوْ شَرِبَ، فَلْيُتِمَّ صَوْمَهُ، فَإِنَّمَا أَطْعَمَهُ اَللَّهُ وَسَقَاهُ)رواه البخاري ومسلم ، واتە: کەسێکی بە رۆژوو لەبیری چوو خواردی یان خواردیەوە با رۆژوو وەکەی تەواو بکات خوا ئەم خواردن و خواردنەوەی پێ بەخشیوە ، بەڵام ئەوەی بیبینێ پێویستە بیری بخاتەوە ئەمە دەچێتە بواری هاوکاری لەسەر چاکە وەك خوای گەورە دەفەرمووێ (وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡبِرِّ وَٱلتَّقۡوَىٰ وَلَا تَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡعُدۡوَٰنِ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ٢ المائدة.

واتە: یارمەتی یەکتری بدەن لەسەر خواناسی و پارێزکاری و چاکەکاری و، نەکەن هاوکاری یەکتری بکەن لەسەر گوناه و ستەم و دەست درێژی کردن.. لە خودا بترسن و خۆتان لە خەشمی خودایی بپارێزن، چونکە بێگومان تۆڵەی خودا زۆر بەتین و پشت شکێنە.

**پرسیاری (٤١) ئایا ئەگەر کەسێك بەیانی کردەوە وتیان ئەمرۆ رەمەزانە ، نەیزانی بوو کە بوەتە رەمەزان وشەویش نیەتی نەهێنا بوو چی بکات ؟**

وەڵام/هەر کەسێ وا بوو ئەوەندەی لەم رۆژە ماوە نابێ هیچ بخوات و ئەبێ ئەم رۆژوەش قەزا بکاتەوە چونکە پێغەمبەر(ﷺ)دەفەرمووێ (مَنْ لَمْ يُجْمِعِ الصِّيَامَ قَبْلَ الْفَجْرِ فَلاَ صِيَامَ لَهُ)رواه اصحاب السنن واحمد . يجمع اي يعزم ، مەرج نیە نیەت بە زمان بێ ئەگەر لە شەو بەسەر دڵی داهات کە بە رۆژوو دەبێ ئەمە نیەتە

**پرسیاری (٤٢) ئافرەتێکی بە رۆژوو لە رەمەزان مێردەکەی بە رۆژوو نەبوو ناچاری کرد بە رۆژ جیماعی لەگەڵ کرد ئایا ئەم ئافرەتە گوناهی دەگاتێ ؟**

وەڵام / ئەم پیاوە فاسقە و تاوانبارە کە بە رۆژوو نابێ ، واجبە هەتا لە توانای ئەو ژنەیە بە قسەی نەکات ، بەڵام ئەگەر بە زۆر جیماعی لەگەڵ کرد ئەوا ژنەکە رۆژوو وەکەی دەشکێ و پێویستە ئەم رۆژووە قەزا بکاتەوە وە گوناهیشی ناگاتێ چونکە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێ (إِنَّ اللَّهَ تَجَاوَزَ لِي عَنْ أُمَّتِي الْخَطَأَ وَالنِّسْيَانَ وَمَا اسْتُكْرِهُوا عَلَيْهِ) واتە: ( لەسەر ئوممەتم نانوسرێ هەڵەو

لەبیرچوون و بە زۆر پێکراو). وە پێویستە ئەم پیاوە زوو تەوبە بکات و لە خوا بترسێ .(بەلام لای مەزهەبی شافیعی مادام بە زۆریە ناشکێ

## پرسیاری (٤٣) ئایا منداڵ لە چەند ساڵی نوێژ و رۆژووی لەسەرە ؟

وەڵام : منداڵ تەکالیفی شەرعی لەسەر نیە وەك پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێ (رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلاَثَةٍ عَنِ النَّائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ وَعَنِ الصَّبِيِّ حَتَّى يَحْتَلِمَ وَعَنِ الْمَجْنُونِ حَتَّى يَعْقِلَ) رواه ابن ماجه . واتە سێ کەس گوناهیان لەسەر نیە خەوتوو تا بەئاگا دێتەوە منداڵ تا گەورە دەبێ شێت تا چاك دەبێتەوە .

بەڵام ئەبێ دایك و باوك وەك ڕاهێنان و فێر کردن منداڵەکانیان بە رۆژوو بکەن ، ئەگەر لە توانایاندا بوو ، وەك پێغەمبەر (ﷺ)دەفەرموێت (مُرُوا أَوْلاَدَكُمْ بِالصَّلاَةِ وَهُمْ أَبْنَاءُ سَبْعِ سِنِينَ ، وَاضْرِبُوهُمْ عَلَيْهَا ، وَهُمْ أَبْنَاءُ عَشْرٍ ، وَفَرِّقُوا بَيْنَهُمْ فِي الْمَضَاجِعِ ) رواه أبو داود و احمد

واتە : فەرمان بەمنداڵەکانتان بکەن بە نوێژ لە (٧) ساڵی، وەلە (١٠) ساڵی لەسەر نوێژنەکردن لێیان بدەن ،و ەجێگەیان لەگەڵ یەکتر جیا بکەنەوە .(بێگومان ئەم لێدان و جێجیا کردنەوە بۆ بەرژەوەندی منداڵە لە دنیا و دوارۆژ) وە گومان لەوەدا نیە رۆژوو گرانترە لە نوێژ

بۆیە ئەبێ بە پلە پلە بێ ، منداڵ لە ٨ و ٩ و ١٠ساڵی دەتوانێ بە رۆژوو بێ و دایك و باوكی چاكتر دەزانن ، لە چەند ساڵی توانای هەیە ، هاوەڵانی پێغەمبەر منداڵی خۆیان بە رۆژوو دەكرد و خەریكیان دەكردن بە یاری ، ئەبێ ئێمەش چاو لە هاوەڵان بكەین

## پرسیاری ( ٤٤ ) ئایا جیاوازی وڵاتە موسڵمان نیشینەكان لە سەرەتاو كۆتایی رەمەزان بۆچی دەگەرێتەوە؟

وڵام : سەرەتا لە پرسیارەكە نەم نوسیوە وڵاتە ئیسلامیەكان چونكە ئێستا لە دنیا هیچ وڵاتێك نیە بەسیستەمی ئیسلام كار بكات ، ئەم جیاوازیە دەگەرێتەوە بۆ جیاوازی رۆژ هەڵات و رۆژ ئاوای وڵاتان كە هەر وڵاتە جیاوازە لەگەڵ ئەوی تر بە كورتی زانایان دوو رایان هەیە وە هەر دوو راش یەك بەڵگە دەهێنەوە.

<u>یەكەم</u> : جمهور دەڵێ لەكوێ جیهان مانگ دیترا واجبە لەسەر هەموو موسڵمانانی جیهان بە رۆژوو بن ، بۆ جەژنیش بەهەمان شێوە. بەم دوو بەڵگە:

١-( فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهۡرَ فَلۡيَصُمۡهُ )البقرة ١٨٥

واتە: هەركەسێك لەئێوە مانگی ڕەمەزانی بینی با بەڕۆژوو بێت

٢-( پێغەمبەرمان (ﷺ)فەرموویەتی (صُومُوا لِرُؤْيَتِهِ ، وَأَفْطِرُوا لِرُؤْيَتِهِ ، فَإِنْ غُمَّ عَلَيْكُمُ الشَّهْرُ فَعُدُّوا ثَلاَثِينَ ». رَوَاهُ مُسْلِمٌ ) واتە:كە

مانگتان دی بە رۆژو بن و کە مانگتان بینی بیشکێنن.ئەگەر هەور بوو ئەوا (شعبان)تەواو بکەن و بیکەن بە سی (٣٠) رۆژ.

٢-**<u>رای دووەم</u>** : دەڵێ هەر وڵاتە بەپێی بینینی مانگی وەڵاتی خۆی ئەم رایەش هەمان ئەم دوو بەڵگەی رای یەکەم دەهێنەوە.

**<u>تێبینی</u>** جگە لەمەزهەبی شافیعی سێ مەزهەبەکەی تر : ئەم جیاوازی هەلاتن و ئاوابوون(**اختلاف المطالع**) رەچاو ناکەن ، لەهەر شوێنێك مانگی یەك شەوە بدیترێ ، بڕیارەکە لەسەر گشت موسڵمانان واجب دەبێ. ئەم یەکبوونی رەمەزان و جەژن ئاواتی هەموو موسڵمانێکە بەلام تا ئێستا لە مێژووی ئیسلام روینەداوە ،هەندێ جاریش ئامانجی سیاسی رێگرە.

## پرسیاری (٤٥) ئایا ئەتوانین دوا ی ئیمساك شت بخۆین ؟

وەڵام : بەڵێ ئەتوانیت دوای ئیمساك خواردن وخوادنەوە بخۆیت تاکو دەرکەوتنی فەجری صادق ،واتە تاکو بانگی بەیانی ، پێغەمبەر (ﷺ)دەفەرموێت (انا معاشر الانبیاء امرنا ان نعجل فطرنا وان نؤخر سحورنا وان نضع ایماننا علی شمائلنا فی الصلاة ) رواه الطبراني واتە ( ئێمەی کۆمەڵی پێغەمبەران فەرمانمان پێ کراوە پەلە بکەین لە فتارکردنەوە ،وە پاشیویش دوابخەین ،وە دەستی راستە لەسەر چەپە دابنێین لە نوێژدا).

**پرسیاری ( ٤٦ ) ئەگەر ژنێك حەملی هەبوو رەمەزان بەرۆژوو نەبوو ، وە ساڵی بەسەردا سورایەوە ، ئایا رۆژوەكان قەزادەكاتەوە یان قەزاو فیدیەش دەدات؟**

وەڵام:پێویستە موسڵمان بە زووترین كات رۆژوەكانی قەزابكاتەوە چونكە مرۆڤ نازانێ كەی دەمرێ ، جمهور دەڵێ ئەوكەسەی ساڵی بەسەردا دەسورێتەوە ، ئەگەر عوزری شەرعی هەبوو وەك نەخۆشی ئەوە تەنها قەزای لەسەرە بەڵام ئەگەر عوزری نەبوو قەزاو فیدیەی لەسەرە، <u>بەڵام ئەبو حەنیفە دەڵێ عوزری هەبێ یان عوزری نەبێ تەنها قەزای لەسەرە</u> ،چونكە خوا دەفەرموێت(فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ ١٨٤ البقرة . واتە: ئەگەر یەكێكتان نەخۆش كەوت، یاخود كەوتە ناو سەفەر، ئەوە دەتوانێت بەڕۆژوو نەبێت و دوایی بە قەزا بیگێڕێتەوە.

**پرسیاری ( ٤٧ ) ئەگەر یەكێك مرد بە هۆی نەخۆشی ئایا منداڵەكانی دەتوانن لەجیاتی رۆژوو وەكان قەزا بكەنەوە ؟**

وەڵام : رۆژووی منداڵەكانی دورست نیە بۆ باوكیان كە بەهۆی نەخۆشی مردوە چونكە رۆژوو وەك نوێژ وایە كەس ناتوانێ لەجیاتی كەس بیكات ، بەلام رۆژووی نەزر ئەتوانی لەجیاتی مردو قەزابكرێتەوە چونكە نەزر وەك قەرز وایە لە ئەستۆیەتی وەك

پێغەمبەر دەفەرموێت(ﷺ) (مَنْ مَاتَ وَعَلَيْهِ صِيَامٌ صَامَ عَنْهُ وَلِيُّهُ) رواه البخاری ومسلم. واتە کەر کەسێك مرد و رۆژووی لەسەر بوو سەرپەرشتیاری بۆی، دەگرێتەوە.

رایتریش هەیە: ئایا عوزری هەبوو یان نا ، کەمتەرخەمی کردیە یان نا.لەمەزهەبی شافیعی درێژەی هەیە.

**پرسیاری (٤٨) ئەگەر کەسێك بەرۆژوو بوو لە رۆژووی سوننەت ، چووە سەردانی خزمێك داوای لیٚ کرا نان بخوات ئەویش خواردی ئایا قەزای لەسەرە؟**

وەڵام : نەخێر رۆژووی سوننەت قەزاکردنەوەی ناویٚ ، مرۆڤ سەرپشکە لە شکاندن و نەشکاندنی ، وەئەگەر تەواو بکات چاکترە، وەك پێغەمبەر دەفەرموێت(ﷺ)(انما مَثَلُ صومِ التّطوعِ مَثَلُ الرّجُلِ يَخرُجُ مِن مالِهِ الصّدقةُ فان شاءَ امَضاها وان شاء حَبَسَها)رواه مسلم والنسائي واتە نموونەی پیاوی بە رۆژوو لە رۆژووی سوننەت وەك کەسێك وایە هەندێك لە ماڵی خۆی جیا دەکاتەوە بۆ خێروسەدەقە ی سوننەت جا ئەگە ر حەز بکات دەیبەخشیٚ وە ئەگەر حەز بکات نایبەخشیٚ واتە سەرپشکە. وەهەروەها پێغەمبەر دەفەرموێت(الصَّائِمُ الْمُتَطَوِّعُ أَمِيرُ نَفْسِهِ إِنْ شَاءَ صَامَ وَإِنْ شَاءَ أَفْطَرَ).رواه اصحاب السنن .

واتــە :ڕۆژووگـری سـوننەت گـەورەی خۆیـەتی ، ئەگـەر حـەزدەکا ڕۆژوەکەی تەواو دەکاو ئەگەر حەزدەکا دەیشکێنێ.

**پرسیاری (٤٩) ئەگەر یەکێك قەزای رەمـەزانی لەسـەر بـوو ئـەتوانێ (٦) شـەش رۆژی شەشـەلان بگرێـت؟ وە ئـەم شـەش رۆژە بەسەر یەکەوە دەگرێت یان بە جیا؟**

وەڵام : شەش ڕۆژووی شەشەلان بە فەرموودە سابت بـووە، وەك پێغەمبەر دەفەرموێت (ﷺ) (شَهْرُ رمَضانَ بعشرةِ اَشْهُرٍ وَصِيامُ سِتَّةِ اَيَّامٍ بِشهرينِ فذلكَ صيامُ السنةِ) رواه النسائي، واتـە مـانگی رەمـەزان پاداشتی دە مانگی هەیە ،شەش ڕۆژووی شەشـەلانیش پاداشـتی دوو مانگی هەیە، بەهەردووکیان دەکاتە ساڵێکی تەواو، بەڵام ئەم شەش ڕۆژە سـوننەتە، وە رەمـەزانیش واجبـە ، واجبـیش پـێش سـوننەت دەخرێ، یەکەم جار ڕۆژوەکـانی رەمـەزان قەزادەکاتـەوە ، لەپاشـان ئـەم شـەش ڕۆژە دەگـرێ، وەمـەرج نیـە ئـەم شـەش ڕۆژە بەسـەر یەکەوە بگرێ دەتوانێ لە دووشەم و پێنج شەم بیـان گرێ پاداشـتی ئەمەشی دەگاتێ .

هەندێ لەزانایان دەڵێن دەتوانی شەشەلان بگریت دوایی رەمـەزان قەزابکیتەوە.

## پرسیاری ( ٥٠ ) ئایا ( پێغەمبەر ( ﷺ ) جگە لە رەمەزان چ مانگێك زۆر بە رۆژوو دەبوو؟

وەڵام: لە مانگی شەعبان زۆر بە رۆژوو دەبوو عائیشەی دایکمان دەڵێ(عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ أَنَّهَا قَالَتْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ(يَصُومُ حَتَّى نَقُولَ لَا يُفْطِرُ وَيُفطِرُ حَتَّى نَقُولَ لَا يَصُومُ [illegible] وَمَا رَأَيْتُ رَسُول اللَّهِ (ﷺ) اسْتَكْمَلَ صِيَامَ شَهْرٍ قَطُّ إِلَّا رَمَضَانَ وَمَا رَأَيْتُهُ فِي شَهْرٍ أَكْثَرَ مِنْهُ صِيَامًا فِي شَعْبَانَ):رواه البخاري و مسلم ، واتە : ئەم بینیوە پێغەمبەر مانگێك بەسەر یەکەوە بەرۆژوبێ جگە لە رەمەزان ، وەشەعبانیش لە هەموو مانگێك زیاتر بە رۆژوو دەبوو، واتە ئەم بینیوە پێغەمبەر مانگێك بەسەر یەکەوە بەرۆژوبێ جگە لە رەمەزان ، وەشەعبانیش لە هەموو مانگێك زیاتر بە رۆژوو دەبوو، وە ئەم فەرموودەی دەڵێ (إِذَا انْتَصَفَ شَعْبَانَ فَلَا تَصُومُوا) رواه اصحاب السنن الاربعة واتە لە نیوەی شەعبان را بە رۆژوو مەبن . ئەحمەدو ئیبنومعین و بەیهەقی دەڵێن زەعیفە

یان هەندێ دەڵێن مەبەست لەم فەرموودە بۆ ئەو کەسانەیە کە بۆ رەمەزان بێهێزە دەبن.

١٨

**پرسیاری (٥١-تاکو- ٦٩) نۆزدە (١٩) بابەتی پزیشکی ( مسائل الطبیة ) کە پیوەندیان بە رۆژوو هەیە ئایا رۆژوو دەشکێنن یان ناشکێن؟**

وەڵام: بەکورتی ئەوەی زانایان لەسەری کوکن کە رۆژوو دەشکێنێ (٣) شتە:

١- خواردن ٢- خواردنەوە ٣- سەرجێی(جیماع) ە.

وەك لەم ئایەتەدا هاتووە. (أُحِلَّ لَكُمۡ لَيۡلَةَ ٱلصِّيَامِ ٱلرَّفَثُ إِلَىٰ نِسَآئِكُمۡ هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمۡ وَأَنتُمۡ لِبَاسٌ لَّهُنَّ عَلِمَ ٱللَّهُ أَنَّكُمۡ كُنتُمۡ تَخۡتَانُونَ أَنفُسَكُمۡ فَتَابَ عَلَيۡكُمۡ وَعَفَا عَنكُمۡ فَٱلۡـَٰٔنَ بَٰشِرُوهُنَّ وَٱبۡتَغُواْ مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمۡ وَكُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلۡخَيۡطُ ٱلۡأَبۡيَضُ مِنَ ٱلۡخَيۡطِ ٱلۡأَسۡوَدِ مِنَ ٱلۡفَجۡرِ ثُمَّ أَتِمُّواْ ٱلصِّيَامَ إِلَى ٱلَّيۡلِ وَلَا تُبَٰشِرُوهُنَّ وَأَنتُمۡ عَٰكِفُونَ فِي ٱلۡمَسَٰجِدِۗ تِلۡكَ حُدُودُ ٱللَّهِ فَلَا تَقۡرَبُوهَا كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ ءَايَٰتِهِۦ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمۡ يَتَّقُونَ ١٨٧ البقرة

هەندێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) وایاندەزانی لە شەوی ڕەمەزاندا، پاش ڕۆژوو شکاندن و نوێژی عیشاو خەوتن، ئەگەر پاش ماوەیەك هەستنەوە بۆ خواردن و خواردنەوەو، نابێت بچنە لای خێزانەکانیان، چونکە ئەوە قەدەغەیەو نابێت.. جا لەم بارەیەوە خودا دەفەرموێت: لە شەوانی ڕەمەزاندا تا نزیك نوێژی بەیانی دەتوانن بچنە لای هاوسەرەکانتان و لەگەڵیان جووت بن، ژن و مێرد هەریەکەیان جلوبەرگ و پەرژینە بۆ ئەوی تریان، خودا دەزانێت

ئێوە واتێدەگەن کە چوونە لای خێزانەکانتان لە شەوی ڕەمەزاندا _پاش خەوتن و هەستانەوەتان_ قەدەغەیەو درووست نیە.. بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا کە واتاندەزانی و باوەڕتان وابوو، کەچی هەر خۆتان ڕاناگرن و دەچنە لایان، خودا لەو تێگەیشتنە هەڵەیەتان خۆشبوو، ئێستا بەبێ ئەوەی لە حەرام بوونی بترسن، بچنە لایان و ئەوەی خودا بۆی بڕیارداون بەئەنجامی بگەیەنن و، دەتوانن تا بەرەبەیان، کە ڕووناکیەکی باریکی ئاشکرا لەلای ڕۆژهەڵاتەوە دەردەکەوێت، بچنە لای هاوسەرەکانتان و، بخۆن و بخۆنەوە، ئینجا دوایی لەسەر ڕۆژوو گرتنەکەتان بەردەوام بن تا ڕۆژئاوا دەبێت .. بەڵام ئەگەر لە شەوانی ڕەمەزاندا بۆ خودا پەرستیی کاتێکی تایبەتیتان لە مزگەوتێکدا بردە سەر _ کە ئەوە (اعتکاف) ی پێ دەڵێن_ ئیتر لەو کاتانەدا نابێت بچنە لای خێزانەکانتان و لەگەڵیاندا جووت ببن .. ئەوانە سنوورەکانی خودان و مەترازێن لێیان .. خودا ئا بەو شێوەیە شێوازی ڕۆژوو گرتنتان بۆ ڕوون دەکاتەوە، تاوەکو بە چاکیی بەندایەتی بکەن و پارێزکار بن و خۆتان لە شوێنکەوتنی ئارەزووەکانتان دوور بخەنەوە. (رفث): لێرەدا بەمانای ئەنجامدانی کاری ژن و مێردایەتی یە، یاخود داواکردنی ئەوەیە بە قسە لە هاوسەر.

شتەکانی تر زانایان قیاس لەسەر ئەم سێ شتە دەکەن وە ڕایان جیایە لەمەڕ شکان و نەشکانی وەك ئەمانەی خوارەوە

۱ • **ئایا تەحامیل ڕۆژوو بە تاڵ دەکاتەوە؟**

وەڵام : ئەگەر بۆ عیلاج و چارەسەر بوو ڕۆژوو ناشکێنێ ، بەڵام ئەگەر بۆ خۆراك و بوژانەوە(الغذاء) بوو ڕۆژوو دەشکێنێ

۲ • **ئایا حوقنە کار لە ڕۆژوو دەکات؟**

وەڵام : حوقنە دوو جۆرە بۆ نەخۆش ئەگەر بەمەبەستی دەرمان بوو نەك خوراك(التغذیة) ئەوە ناشکێ ، جا چ لەماسولکەبێ یان دەمار یان کۆم ، بەڵام ئەو حوقنەی بۆ خۆراکە (الغذاء) ئەوە ڕۆژوو دەشکێنێ چونکە دەچێتە قالبی خواردن و خواردنەوە.

**ئاگاداری:** هەندێ لە زانایان دەڵێن حوقنە لە کۆم ڕۆژوو دەشکێنێ بۆیە تەقواو وخۆپارێزی چاکترە

۳ • **ئایا ئەو حەبانەی لە ژێر زمان دادەنرێن ڕۆژوو بەتاڵ دەکەن؟**

وەڵام: بەلێ ئەو حەبانەی لە ژێر زمان دادەنرێن ڕۆژوو دەشکێنن.

٤ • **ئایا ئەو مەرهەمەی خۆی پێ چەور دەکرێت ڕۆژوو دەشکێنێ؟**

وەڵام: نەخێر ڕۆژوو ناشکێنێ.

٥ • **ئایا قەترە رۆژوو دەشکێنێ؟**

قەترەکان رۆژوو ناشکێنن چ لە گوێ بکرێ یان لەچاو یان لە لووت چونکە خواردن و خواردنەوە نینە ، وە ناچێتە بۆشای هەناو بەرێچکەی خواردن و خواردنەوە کە دەمە.

**ئاگاداری** : هەندێ لەزانایان دەڵێن قەترەی لووت ئەگەر چووە ناو قورگی رۆژوو دەشکێنێ.

٦ • **ئایا دەرمانی رەبۆ(بخاع) بۆ نەفەس تەنگی بەکار دێ رۆژوو دەشکێنێ؟**

وەڵام : بوخاع ماددەیەکی شلە بەکاردێ بۆ فروانکردنی دەماری هەناسە و ناگاتە گەدە وەك هەندێ لە دکتورەکان دەڵێن بۆیە رۆژوو ناشکێنێ.

٧ • **ئایا ئەو دەرمانانەی بە کاردێ بۆ غەرغەرە رۆژوو دەشکێنن؟**

وەڵام: رۆژوو ناشکێنن ئەو دەرمانانەی بۆ غەرغەرە بەکاردێن، مادام قوتیان نەداتەوە ، بەڵام ئەگەر قوت بدرێن رۆژوو دەشکێنن.

٨ • **ئایا ئۆکسجین رۆژوو دەشکێنێ؟**

وەڵام : نەخێر رۆژوو ناشکێنێ چونکە خواردن و خواردنەوە نییە، بەلکو لەپێکهاتەکانی هەوایە کە ئێمە هەڵیدەمژین.

٩ • **ئايا ئەو دەرمانەی بەهەڵم (التبخر) دەدرێتە نەخۆش ڕۆژوو دەشكێنیٚ.**

وەلام: نەخێر ڕۆژوو ناشكێنیٚ.

١٠ • **ئايا خۆين گرتن (سحب الدم) ڕۆژوو دەشكێنی؟**

وەڵام : نەخێر ڕۆژوو ناشكينیٚ

١١ • **ئەگەر مرۆڤ توشی نەزيفی بوو ئايا ڕۆژوو وەكەی دەشكیٚ؟**

وەڵام: ڕۆيشتنی خوێن لەبەر مرۆڤ ڕۆژوو ناشكێنیٚ چ لە دەم بیٚ يان لووت يان دەم وچاو يان سەر ، بەڵام ئەگەر خوێن لە قورگی چووە خوارەوە ڕۆژوو دەشكێنیٚ وەك كەسێك ددانی خرێنە بكێشێت و خوێن بچێتە قورگی .

١٢ • **ئايا پشكنينی (الفحص) دامێنی ژن ڕۆژوو دەشكێنیٚ؟**

وەڵام: پشكنينی (الفحص) دامێنی ئافرەت ڕۆژوو ناشكێنی . بەڵام را هەيە دەڵیٚ دەشكیٚ

١٣ • **ئايا پشكنينی كۆمی نەخۆش ڕۆژوو دەشكێنیٚ؟**

وەڵام: پشكنينی كۆم ڕۆژوو ناشكێنیٚ. بەڵام را هەيە دەڵیٚ دەشكیٚ

١٤ • **ئايا جگەر ڕۆژوو دەشكێنی؟**

وەڵام : بەڵیٚ جگەرە رۆژوو دەشكێنیٚ ، ئەهلی عيلم يەكدەنگن لەسەری لەزانايانی هاوچەرخ و جگە لەوانيش.

١٥ ● **ئایا دورستە ئافرەت دەرمان بەكار بێنێ بۆ دواخستنی حەیز تاكو هەموو رەمەزان بگرێ؟**

وەڵام: بەڵێ دورستە ئافرەت دەرمان بەكاربێنێ تاكو حەیزی دوابخات و رەمەزان بەتەواوی بگرێ ، نەخواردنی چاكترە ، وە پێویستە راوێژ بە دكتۆر بكات نەوەك زیان بە تەندورستی بگەینێ.

١٦ ● **ئایا دورستە لەكاتی بە رۆژوو بوون فلچە و مەعجون بەكاربێنێ؟**

وەڵام : پێویستە مرۆڤی بە رۆژوو پێش بانگی بەیانی یان دوایی رۆژوو شكاندن و شەو فلچەو مەعجون بەكاربێنێ ئەمەیان چاكترە ، بەڵام ئەگەر بەكاریشی هێنا لە كاتی بە رۆژوو بوون قەی ناكا بە مەرجێ هیچی قوت نەداتەوە ، ئەگەر هیچی قوت دایەوە رۆژووەكەی دەشكێ.

١٧ ● **ئایا بە رشانەوە رۆژوو دەشكێ؟**

وەڵام: ئەگەر بێ دەستی خۆی رشایەوە ناشكێ، بەڵام ئەگەر بەخۆی خۆی رشاندەوە دەشكێ.

١٨ ● **ئایا ئافرەتی حامیلەو شیردەر رۆژوویان لەسەرە؟**

وەڵام : ئەگەر توانایان هەبوو و زیانیان پێ نەدەگەیشت ئەوە واجبە بە رۆژوو بن ، بەڵام ئەگەر توانایان نەبوو و زیانیان پێ دەگیشت بۆیان هەیە بە رۆژوو نەبن و دواتر قەزای بكەنەوە.

**پرسیاری (٧٠) ئەگەر ئافرەتی (سکپڕ) یان (شیر دەر) بە رۆژوو نەبوون لە رەمەزان ئایا چییان دەکەوێتە سەر؟**

وەڵام / زانایان رایان جیایە لەم بارەوە چوار رایان هەیە ١- حامیلەو شیرەدەر تەنها فیدیان لەسەرە بێ قەزاکردنەوە، ئەمەش لە ئیبنو عەبباس و ئیبنو عومەر نەقل کراوە. ٢ - تەنها قەزاکردنەوەیان لەسەرە بێ فیدیە، ئەمەش قسەی کۆمەڵێك لە زانایانە. ٣- قەزاو فیدیانە لەسەرە ، ئەمەش قسەی مجاهیدو یەکێ لەقەولەکانی شافیعی و ئەحمەدە. ٤-شیردەر قەزادەکاتەوە و فیدیەش دەدات، بەلاَم حامیلە تەنها قەزادەکاتەوە.

**رای پەسند: زۆر لە زانایان خاڵی (٢) تەرجیح و پەسند دەکەن کە تەنها قەزایان لەسەرە بێ فیدیە ، لەم زانایانەش حەسەنی بەسری وئیبراهیمی نەخەعی و عەتاو زوهری و زوحاك وئەوزاعی و رەبیعە و سەوری و ئەبو حەنیفە و لەیس و تەبری و ئەبو سەورو ئەبو عوبیدو..........هتد.**

**پرسیاری (٧١) جیاوازی کەفارەت و فیدیە چیە؟ وە کەی واجب دەبێ؟**

وەڵام / سەرەتا (فدية) ئەوەیە : بە هۆی نەکردنی خواپەرستنێك واجب ببێ . (كفارة) ئەوەیە :بەهۆی گوناهێك واجب ببێ ، وە زۆر کەس لێکیان جودا ناکاتەوە بەلاَم لێك جیان ، فیدیە: ئەوەیە وەك

لەم ئایەتـەدا هـاتووە( وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ فَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُۥ وَأَن تَصُومُوا۟ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ١٨٤ البقرة

وە ئەو کەسانەیش کە بـە زەحمـەت نـەبێت نـاتوانن بـەڕۆژوو بـن، ئەمەیە مانای: وعلي الذين يطيقونه وەکو پیاوی پیر، یـان نەخۆشـێك کە چاك بوونەوەی نەبێت،.. ئەمانە بۆیان هەیە کـە بـەڕۆژوو نـەبن و، لەبری هەر ڕۆژێك (فیدیـە) بـدەن، واتـە: ژەمێـك خـواردن بـدەن، جـا خواردنەکە خۆی بدەن، یان نرخی ژەمێك خواردن بدەن .. خۆ ئەگەر زەحمەتی ڕۆژوو گرتنەکەیان زۆر زیاد نەبێت، ئەوە بـەڕۆژوو بوونیـان باشترە، ئەگەر بە جوانی سەرنجی بدەن و لێی

وورد ببنەوە.. چونکە بەڕۆژوو بـوون مایـەی نزیـك بوونەوەیـە لـە خوداو، هۆکارێکی کاریگەریشە بۆ تەندروستیی ئادەمیزاد

بەلاّم کەفارەت ئەوەیە وەك لەم فەرموودەدا هـاتووە ،(عَنْ أَبِـي هُرَيْرَةَ قَالَ : جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) فَقَالَ : هَلَكْتُ يَا رَسُولَ اللَّـهِ قَالَ ، وَمَا أَهْلَكَكَ. قَالَ : وَقَعْتُ عَلَى امْرَأَتِي فِي رَمَضَانَ. قَالَ ، فَهَـلْ تَجدُ مَا تُعْتِقُ رَقَبَةً ،. قَالَ لاَ، قَالَ : فَهَلْ تَسْتَطِيعُ أَنْ تَصُـومَ شَـهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ. قَالَ لاَ ، قَالَ : فَهَلْ تَجدُ مَا تُطْعِمُ سِتِّينَ مِسْكِينًا. قَـالَ لاَ ، قَالَ ، ثُمَّ جَلَسَ فَأُتِيَ النَّبِيُّ (ﷺ)بِعَرَق فِيهِ تَمْرٌ فَقَالَ : تَصَـدَّقْ بِهَـذَا فَقَالَ أَفْقَرُ مِنَّا فَمَا بَيْنَ لاَبَتَيْهَا بَيْتٌ أَحْوَجُ إِلَيْهِ مِنَّا فَضَـحِكَ النَّبِـيُّ (ﷺ) حَتَّى بَدَتْ أَنْيَابُهُ ، ثُمَّ قَالَ لَهُ ، اذْهَبْ فَأَطْعِمْـهُ أَهْلَـكَ ). رَوَاهُ

الْبُخَارِيُّ و مُسْلِمٌ) کابرایك هاتــە لای پێغەمبــەر (ﷺ) وتــی فــەوتاووم ئەی نێرراوی خوا ،فەرمووی بۆچی؟ وتی بەرۆژ لـە رەمـەزان جیمـاعم لەگەڵ خێزانی خۆم کردیە ، پێ فەرموو بەندێك ئازاد بکە، کـابرا وتـی ناتوانم ،فەرمووی(٦٠) رۆژ لەسەر یەك بە رۆژوو بە ، کابرا وتی ناتوانم ، پێ فەرموو (٦٠) فەقیر نان بدە، کابرا وتـی نـاتوانم ، دانیشـت لـەم کاتدا سەبەتێك خورما بۆ پێغەمبەر هات فـەرمووی بـرۆ ئـەم سـەبەتە خورمایە بکە خێر ، کابرا وتی لە من فەقیر تـر نیـە، پێغەمبـەر (ﷺ) پێکەنی و فەرمووی برۆ بیدە کەس و کاری خۆت .

**ئاگاداری** : کەفارەتی جیماع بەریز بەندیە:

١- یەك بەندە ئازاد کردن کە لەم زەمانە نەماوە.

٢- دوو مانگ لەسەر یەك بەرۆژوو بوون بێ پچران مەگـەر عـوزری شەرعی هەبێ.

٣- نان دانی (٦٠) فەقیر.

وەئـەبێ ئـەم رۆژوو وەش بگرێتــەوە ، وەتەوبــەش بکـات، ئـەم کەفارەتە تایبەتە بە مانگی رەمەزان ، ئەم کەفارەتە واجبە.

**بۆ زانیاری:** جگە لە رەمەزان جیماع ئەم کەفارەتەی ناوێ

**پرسیاری ( ٧٢ ) ئەگەر کەسێك جەنابەتی لەسەر بوو، بەلاّم خۆشۆشتنی خستە دوایی بانگی بەیانی ئایا رۆژووەکەی دروستە؟**

وەلاّم: بەڵێ رۆژووەکەی دورستە ، چونکە پاکی لە جەنابەت بەمەرج دانەنراوە بۆ رۆژوو ، بەلاّم لەسەری واجبە خۆی بشوات بۆ کردنی نوێژی بەیانی .

**پرسیاری ( ٧٣ ) ئەگەر کەسێك بە ئەنقەست لە رەمەزان رۆژووی شکاند چی لەسەرە؟**

وەڵام : واجبە تەوبە بکات ، چونکە گوناهێکی گەورەی ئەنجام داوە ، وە ئەبێ لە جیاتی هەر رۆژێك رۆژوویێك بگرێتەوە.

**پرسیاری ( ٧٤ ) ئایا دورستە لەکاتی بە رۆژووبونی ( ٦ ) رۆژی شەووال نیەتی قەزاش بێنی بۆ ئەوەی مانگی رەمەزانی لەسەرە واتە (نیەتی واجب و سوننەتی لێ بینی ) ؟**

وەڵام : نەخێر دورست نیە ، چونکە هەر یەکەیان عیبادەتێکی سەربەخۆیە و ناچنە ناو یەکتری، جا ئەگەر کەسێك وایکردبوو کامیانی بۆ حیسابە، زانایان رای جودایان هەیە هەیانە دەڵێ

واجبەکەی بۆ حیساب دەکرێ ، چونکە واجب لە پێشترە لە سوننەت،

## پرسیاری ( ۷۵ ) ئایا دورستە لە رەمەزان چێشتخانە بکرێتەوە؟ وەئەگەر خواردنەکە خەڵکی ناموسڵمان بخوات دورستە؟

وەڵام: نەخێر دورست نیە لە رۆژانی رەمەزان چێشتخانە بکرێتەوە، چونکە ئەمە بێ رێزی و بە سووك سەیر کردنی مانگی پیرۆزی رەمەزانە و یارمەتی دانی گوناە و تاوانە. خوا دەفەرموێت (وَتَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ ۖ وَلَا تَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٢﴾ المائدة:) واتە: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان ، یارمەتی و کۆمەکیی یەکتر بکەن لەسەر چاکەو خواناسی، نەکەن یارمەتی وکۆمەکی یەکتر بکەن لەسەر گوناهو دەستدرێژی، لە خوا بترسن و پارێزکار بن، چونکە بەڕاستی خوا زۆر بەتوندی تۆڵە دەسێنێت

وە ئەوانەی عوزی شەرعیان هەیە بە رۆژوو نەبن لە رەمەزان وەك نەخۆش و رێبوار و ئافرەتی حەیزدار و .....هتد، واجبە لەسەریان بێ رۆژووی خۆیان دەرنەخەن لەبەر چاوی خەڵکی،

## پرسياری( ٧٦ ) ئايا ئيعتكاف جگە لە مزگەوتی مككە و مەدينە و قودس دورستە؟

وولاّم: بەڵێ دورستە شيخ محمد صالح عوسمين دەفەرموێت هەموو مزگەوتەكانی دنيا سوننەتە ئيعتكافيان تيا بكرێ ، ئعتيكاف تايبەت نيە بەم سێ مزگەوتە ، ئەو حەديسەی دەڵێ(**لا اعتكاف الا في المساجد الثلاثة**) ئەم حەديسە زەعيفە

وە هەندێ زانا دەفەرموون هەرمزگەوتێك جەماعەتی تيا بكرێ دورستيشە ئيعتيكاف تيا بكرێ چونكە خوا بە راهايی باسی مزگەوت دەكات دەفەرموێت(وَلَا تُبَٰشِرُوهُنَّ وَأَنتُمۡ عَٰكِفُونَ فِي ٱلۡمَسَٰجِدِ)البقرة ١٨٧

## پرسياری ( ٧٧ ) ئايا پێغەمبەر چۆن هەڵسوكەوتی لەگەڵ رەمەزن دەكرد كاتێ ئەم مانگە دەهات؟

**وەڵام: بە كورتی هەڵسوكەوتی پێغەمبەر بەم شێوە بووە.**

١. بەشاهێدی يەك شاهێد دەيكردە ڕەمەزان ئەگەر كەس مانگی نەديبايە سی شەعبانی تەواو دەكرد

٢. كە ڕەمەزان هاتن جێگير دەبوو " ئينجا نيەت پێويستە (مَنْ لَمْ يُجْمِعِ الصِّيَامَ قَبْلَ الْفَجْرِ فَلاَ صِيَامَ لَهُ) رواه ابو داود

٣. لە سونەتەکانی پێغەمبەرە پارشیو کردن (تَسَحَّرُوا فَإِنَّ فِي السَّحُورِ بَرَكَةٌ)رواه البخاری ومسلم واتە : پارشێو بکەن چونکە خواردنی پارشێو خواردنێکی موبارەکە

٤. پەلە کردن لە رۆژوو شکاندن " پیغەمبەر فتارکردنەوەی پێش نوێژی مەغریب دەخست ، بە خورما ئەگەر خورما نەبوایە بە ئاو دەیفەرموو (لايزال الناس بخير ما عجلوا الفطر )رواه مسلم والبخاري واتە: خەڵك بەردەوام لەخێردان مادام پەلە دەکەن لە رۆژوو شکاندن.

٥. دوعا لە کاتی فتار کردنەوە زۆر دوعا هەیە لەم بارەیەوە یەکێ لە وانە دەیفەرموو ( الحمدلله الذی اعانني فصمت ورزقني فأفطرت ) رواه ابو داود واتە : سوپاس بۆ خوا یارمەتی دام بەرۆژوو بووم ، وە رزقی دام رۆژووم پێ شکاند.

٦. لە سونەتەکانی پێغەمبەر ئەنجامدانی نوێژی تراویح

٧. زۆر عیبادەت کردن لە (١٠) شەوی کوتایی رەمەزان

٨. اعتیکاف کردن و مانەوە لە مزگەوت

٩. زۆر قورئان خوێندن

١٠. زۆر خێرو سەدەقە کردن

**پرسیاری ( ٧٨ ) ئایا دروستە لە شەوانی رەمەزان پیاو بچێتە لای خێزانی ؟**

وەڵام / بەڵێ دروستە پیاو بچێتە لای خێزانی خۆی لەشەوی رەمەزان لە پاش نوێژی مەغریب تاکو نوێژی بەیانی .

**پرسیاری ( ٧٩ ) ئایا خوێن بەخشین رۆژو دەشکێنی ؟**

وەڵام / لەسەر قەولی پەسندی زانایان خوێن بەخشین رۆژوو ناشکێنی وەك لە بوخاری دا هاتووە کە ئیبنو عەبباس دەفەرمووی(أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) احْتَجَمَ وَهُوَ صَائِمٌ) واتە پێغەمبەر حیجامەی کرد بە رۆژوو بوو ، وە هەروەها خوێن لە خۆ گردن بۆ پشکنین رۆژو ناشکێنێ

بە کورتی خوێن بە خشین و خوێن لە خۆ گرتن و حیجامە رۆژو بەتاڵ ناکەن بەڵام دەبێ ڕەچاوی ئەو بکرێت نەبێتە هۆکاری ئەوەی ڕۆژووەوان بێ هێزبێ دواتر ڕۆژوەکەی بشکێنی

**پرسیاری ( ٨٠ ) ئایا چ جۆرە نەخۆشێك بۆی هەیە بە ڕۆژوو نەبێ ؟**

وەڵام /دیارە بەدەقی ئایەت نەخۆشی روخسەتە ، وە زانایان ڕای جۆراو وجۆریان هەیە ، ڕای پەسەند ئەوەیە **هەر نەخۆشیەك بە ڕۆژوو زیاد بکات یان چاك بونەوەی دوا بخات** ئەو دووانە دەتوانن بە

رۆژو نـەبن لـە ئیمام ئەحمەدیان پرسی کەی نەخۆش دەتوانێ بەرۆژوو نەبێ فەرمووی ئەگەر لە توانای دانەبێ .زۆر نەخۆشی هەیە مرۆڤ بێ توانا دەکات " وا چاکە خۆی تاقیبکاتەوە ڕۆژێك دوو ڕۆژ ئەگەر بێ توانا بوو با موسڵمان روخسەت هەڵبژێرێ وەك پێغەمبەر دەفەرموێت(إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ أَنْ تُؤْتَى رُخَصُهُ كَمَا يُحِبُّ أَنْ تُؤْتَى عَزَائِمُهُ) رواه احمد واتە : خوا پێخۆشە روخسەتی وەرگرن هەروەك پێخۆشە هیممەت وەرگرن.

## پرسیاری (٨١)حوكمی ئەو كەسە چییە كە لە رەمەزان بە رۆژوو نابێ و بە ئاشكراش شت دەخوات؟

وەڵام/ شتێكی ئاشكرایە رەمەزان واجبە بە قورئان و سوننەت ، وە روكنێكە لە ئەركانی ئیسلام ، جا بە رۆژوو نەبوون تاوانێكی گەورەیە و بێ ئەمری كردنی خوا و پێغەمبەرە، وە بە ئاشكرا كردنی ئەم تاوانەش سزاكەی گەورەترە و قورسترە خوا بمانپارێزی، پێغەمبەر دەفەرموێت( قال رسولُ الله (ﷺ) لا غِيبَةَ لفاسِق ، ولا مُجاهر ، وكلُّ أمتي معافى إِلا المجاهرون». أخرجه الترمذي.). واتە : غەیبەت نیە باسی فاسق و گوناه كەری بەئاشكرا بكرێت ،هەموو ئومەتم دەبوردرێت تەنها ئەوانی گوناه دەكەن و دێن ناو خەڵكش

باسی دەکەن). ئەمانە خەڵك چاویان لێ دەکات ، تاوان و بەد رەوشتی بڵاودەکەنەوە، کۆمەڵگا وێران دەکەن.

## پرسیاری ( ٨٢ ) ئەگەر کەسێك لە تەلەفزیۆن گوێ لە بانگ بوو و رۆژووی شکاند ، دوایی بۆی دەرکەوت ئەم بانگە هی وڵاتێکیتر بووە ئایا حوکمی ئەو کەسە چییە ؟

وەڵام / زانایان دوو رایان هەیە لەم بارەوە ، رای بەهێز جمهورە لە زانایانی هەرچوار مەزهەب دەڵێن ئەبێ ئەم رۆژووە قەزابکاتەوە، چونکە جیاوازی هەیە لە نێوان لە بیرچوون و هەڵە کردن ، پێغەمبەر دەفەرموێت لەبارەی لە بیر چوون(مَنْ نَسِيَ وَهُوَ صَائِمٌ، فَأَكَلَ أَوْ شَرِبَ، فَلْيُتِمَّ صَوْمَهُ، فَإِنَّمَا أَطْعَمَهُ اَللَّهُ وَسَقَاهُ) - مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ (واتە :کەسێکی بەرۆژوو لە بیری چوو خواردی یان خواردیەوە بارۆژووەکەی تەواو بکات ناشکێ ئەم خواردن و خواردنەوە خوا پێبەخشیوە)ئیمامی خەتتابی دەفەرموێت (مرۆڤی لە بیر چوو دەستەڵاتی نیە بەسەر لە بیرچوون ، بەلام هەڵەکار دەتوانێ خۆی بپارێزێ) . وە ئەم فەرموودەیەی دەڵێ(رفع عن امتي الخطأ والنسيان واستكرهوا عليه) رواه الطبرني فان المرفوع في الحديث هو الاثم واما الحكم هو القضاء فلا يرفع ، واتە ئەم فەرموودەی دەڵێ هەڵە و لەبیرچون و زۆری لێکردن لەسەر ئوممەتم هەڵگیراوە ئەم

هەڵگرتنە واتە گوناهی لەسەر نانوسرێ بەڵام قەزاکردنەوەی لەسەر دەمێنێ ،رای دووەم دەڵێ قەزای لەسەر نیە . بەکورتی ئیحتیات وەرگرتن باشترە لە هەردوو را.

**پرسیاری ( ٨٣ ) ئەگەر کەسێك بەرۆژوو نەبوو لە رەمەزان بەبێ عوزری شەرعی ، دوایی رەمەزانێکی تر هاتەوە ئەو کەسە تۆبەی کرد ئایا تەنها قەزای لەسەرە یان قەزاو فیدیە؟**

وەڵام : ئەو کەسە ئەگەر تۆبەی کرد یەکەم جار ئەم رەمەزانە دەگرێ کە لەناویدایە، دوای رەمەزانە فەوتاوەکە قەزادەکاتەوە، ، جا هەندێ لە زانایان دەڵێن بۆ ئەو رەمەزانەی ساڵی بەسەردا سوراوەتەوە ئەبێ قەزابکاتەوە و فیدیەش بدات، بەڵام ئەبو حەنیفە و هاوڕیانی دەڵێن تەنها قەزاکردنەوەی لەسەرە بێ فیدیە جا عوزری شەرعی هەبێ یان نەبێ چونکە خوا دەفەرمووێت (وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ ١٨٥ البقرە ئەو کەسەی نەخۆش بێت، یاخود لە سەفەردا بێت، دەتوانێت بەڕۆژوو نەبێت و، دوایی بە قەزا بیگێڕێتەوە. شەوکانیش ئەم رایە پەسند دەکا

**پرسیاری ( ٨٤ ) زۆر جاران گوێمان لە حەدیسێك دەبێ کە پێغەمبەر دەفەرموێت ( إِذا سَمِعَ أَحَدُكُمْ النِّدَاءَ وَالْإِنَاءُ عَلَى يَدِهِ فَلَا يَضَعْهُ حَتَّى يَقْضِيَ حَاجَتَهُ مِنْهُ ) أحمد ، وأبو داود ، والحاكم ، والبيهقي ) واتە ئەگەر یەکێك خواردنی لەدەست دابوو بانگی دا با بیخوات جا ئایا دورستە لەکاتی بانگ بەردەوام بین لەسەر خواردن؟**

وەڵام / شتێکی ئاشکرایە ڕۆژوو لە کاتی دەرکەوتنی فەجری صادق دەست پێ دەکات کە کاتی بانگی بەیانییە وەك خوا دەفەرموێت وَكُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ مِنَ ٱلْفَجْرِ ثُمَّ أَتِمُّوا۟ ٱلصِّيَامَ إِلَى ٱلَّيْلِ ١٨٧ البقرة واتە : دە بخۆن و بخۆنەوە هەتا بە ڕوونی بەرەبەیان و سپێدەتان بۆ دەردەکەوێت و لە ڕۆژهەڵاتەوە دیاردەدات و تاریکی شەو لادەبات، لەوەودوا ڕۆژووەکەتان ببەنە سەر تا شەو دادێت و (خۆرئاوا دەبێت) . جا ئەگەر فەجری صادق هات خواردن و خواردنەوە قەدەغەیە ، بەڵام لە ئەسڵدا دوو بانگ هەیە بانگی یەکەم کاتی فەجر نیە و ئەتوانیت خواردن و خواردنەوە بخۆیت وەك لەم فەرموودەدا هاتووە ، (إِنَّ بِلَالاً يُؤَذِّنُ بِلَيْلٍ فَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يُؤَذِّنَ ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ) رواه البخاري و مسلم واتە بیلال بانگ بە شەو ەدات بخۆن و بخۆنەوە

تاكو كوری ئوم مەكتوم بانگ دەدات ›. ئبن قەییم دەڵێ جمهور بۆ ئەوە چووینە لە دوای دەركەوتنی فەجر نابێ شت بخورێ كە ئەمە قسەی پێشەوایانی هەر چوار مەزهەبە بەڵام ئەو فەرموودەی دەڵێ(إِذَا سَمِعَ أَحَدُكُمْ النِّدَاءَ وَالْإِنَاءُ عَلَى يَدِهِ فَلَا يَضَعْهُ حَتَّى يَقْضِيَ حَاجَتَهُ مِنْهُ) دەگونجێ لەگەڵ بانگی یەكەمی بێ بەم شێوە فەرموودەكان دژایەتیان لەگەڵ یەكتر نابێ ، لەفەرموودەیتر هاتووە.( عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ(ﷺ)( لاَ يَمْنَعَنَّ أَحَدًا مِنْكُمْ أَذَانُ بِلاَلٍ أَوْ قَالَ نِدَاءُ بِلاَلٍ مِنْ سُحُورِهِ فَإِنَّهُ يُؤَذِّنُ أَوْ قَالَ يُنَادِي لِيَرْجِعَ قَائِمُكُمْ أَوْ لِيَنْتَبِهَ نَائِمُكُمْ). رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ مُسْلِمٌ )

**پرسیاری ( ٨٥ ) ئایا دورستە ژن ئیعتكاف بكات لە مزگەوەت ؟**

وەڵام / ئیعتكاف واتە : مانەوە لە مزگەوت بەمەبەستی خواپەرستی شتێكی مەشروعە بۆ پیاو وژن ، بەڵام ئەوندە هەیە ئافرەتی بە مێرد ئەبێ بە ئیزنی مێردەكەی بێ، بێ مێردیش بە ئیزنی سەرپەرشتیاری، ئیبنو قودامەی مەقدیسی دەڵێ بۆ ئافرەتان لە هەموو مزگەوتێك دورستە ئیعتیكاف بكەن با ئەم مزگەوتە جەماعەتیشی تیا نەكرێ ، چونكە جەماعەت لەسەر ژنان واجب نیە. ئەبو حەنیفەو سەوری دەڵێن بۆ ژن دورستە لە ماڵی خۆی شوێنێك بكاتە مزگەوت و ئیعتیكافی تیا بكات ئەمە بۆی چاكترە و باشترە.

**پرسـیار/ ( ٨٦ ) دوو پرسـیار١- ئـایـا ڕۆژووگـرتن بـێ نوێـژکردن قەبوولـە، ٢- وە ئـەم فەرموودەییـەی دەڵێ ( وَمَـنْ صَـامَ رَمَضَانَ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِـهِ ) ئـایـا گووناهی گەورەو بچوك دەگرێتەوە ؟**

**وەڵامی یەکەم :(** ئایا ڕۆژوو بێ نوێژ قەبولـە زۆر لـەزانایان دەلـێن نوێژ نەکـەر کـافرە ، کـافریش عیبـادەتی قـەبول نیـە، بەبەڵگـەی ١- قورئـان(فَإِن تَابُواْ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ فَإِخْوَٰنُكُمْ فِي ٱلدِّينِ وَنُفَصِّلُ ٱلْأَيَٰتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ١١ التوبة .

ئینجا ئەگەر پەشیمان بوونەوە و نوێژیان بەجێ هێنـا و زەکاتیـان دا ئەوە براتـانن لـە ئاییـندا وە ئێمـە بەڵگـەکان ڕوون دەکەینـەوە بـۆ گەلێك کەدەیزانن.

٢- فـەرموودە (الْعَهْدُ الَّذِى بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمُ الصَّلاَةُ فَمَنْ تَرَكَهَـا فَقَـدْ كَفَرَ) اخرجه احمد واتە پەیمانی نێوان ئێمە و کافران نوێژە ، ئـەوەی وازی لێ بێنێ کافرە .

٣- قسەی هاوەڵانی پێغەمبەر زۆر لە هاوڵان نوێژنەکـەر بـە کـافر دادەنێن لەو انە ئیمامی عومەر دەفـەرموێت(عَنْ عُمَرَ بْـنِ الْخَطَّـابِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّهُ قَالَ : لاَ حَظَّ فِي الإِسْلاَمِ لِمَنْ تَرَكَ الصَّـلاَةَ. وَعَـنْ عَلِيٍّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ : مَنْ لَمْ يُصَلِّ فَهُوَ كَافِرٌ. وَعَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ

مَنْ لَمْ يُصَلِّ فَلاَ دِينَ لَــهُ)روا ه البيهقي واتـه بەشـی نیـه لـه ئیسـلام ئەوەی واز لە نوێژ بێنێ.

٤- عەبدولای کوری شـەقیق دەڵـێ (وعن شقِيق بن عبدِ الله التَّابعيِّ المتفق عَلَى جَلاَلَتِهِ رَحِمهُ اللهُ ، قَالَ : كَانَ أصْحَابُ مُحَمَّدٍ (ﷺ)لا يَرَوْنَ شَيْئاً مِنَ الأعْمَالِ تَرْكُهُ كُفْرٌ غَيْــرَ الصَّــلاَةِ . رَوَاهُ التِّرمِــذِيُّ) واتـه هاوەڵاتی پێغەمبەر وازهێنانی هیچ کارێکیان بـه کـوفر دانـەناوە جگـه لە نوێژ.

**ولأمی دووەم : (مَنْ صَامَ رَمَضَانَ) واتە هەر کەسێك لە رەمـەزان بـە رۆژوو بێ (إِيمَانًا) واتە بڕوای بەخوا هەبێ** و هەرچی هـەواڵی پێـداوی بەراستی بزانی ،( وَاحْتِسَابًا) واتە رۆژوو وەکە بۆ رەزامەندی خوا بێ و داوای پاداشتیش لەو بکـەی .( غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ) لـە گونـاهی رابـردووی دەبـوردرێ. جمهـور دەڵـی ئـەم لێبورنـە گونـاهی گـەوە ناگرێتەوە. بەبەڵگەی پێغەمبەر دەفەرموێت(الصلوات الخمس و الجمعة إلى الجمعة و رمضان إلى رمضان مكفرات ما بينهما إذا اجتنبت الكبائر) رواه مسلم. واتـە :لـە نێوان پێـنج نوێـژە فـەرزەکان و هـەینی بۆ هــەینی ورەمــەزان بـۆ رەمــەزان گونـاه رەش دەبنــەوە ، ئەگــەر خۆپارێزی کرا لەگوناهە گەورەکان.

## پرسیاری ٨٧/ئایا قوتابی لە کاتی تاقیکردنەو( امتحان ) دەتوانێ بە رۆژوو نەبێ؟

وەڵام :نەخێر دورست نیە بە رۆژوو نەبێ بە بیانوی تاقیکردنەوە ، چونکە دەتوانێ بە شەو بخوێنێ لە جیاتی رۆژ باشتریش دەخوێندرێ ، بەتایبەتی زۆر لە خەڵکی ئەم زەمانە شەوانی رەمەزان ناخەون .

## پرسیاری ٨٨/ ئایا کێ بۆی رەوایە رۆژوو بشکێنێ لە رەمەزان؟

وەڵام : ئەوانەی بۆیان رەوایە بە رۆژوو نەبن چەند جۆرێکن لەوانە: ١- نەخۆش وریبوار ،بەبەڵگەی (فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ ١٨٤ ))البقرة ١٨٤)

٢- ئافرەتی حامیلە و شیر دەر ئەگەر لە خۆیان یان لەمنداڵەکەیان یان لەخۆی و منداڵەکەی بترسێن زیانیان پێ بگات.

٣- حەیزدارو منداڵ بوو ئەبێ رۆژوو وەکەیان بشکێنن ، بەڵکو حەرامە بە رۆژوو بن.

٤- بۆ بەرژەوەندی کەسێك کە رزگاری بکات ، بۆ نموونە کەسێك ئاگر دەوری داوە ئەو دەچێت رزگاری دەکات.

**پرسیاری ٨٩/ئەگەر کەسێك چووە عومرە لە رەمەزان ئایا بۆی هەیە بە رۆژوو نەبێ؟ وەدیارە رەمەزان واجبەو عومرەش سوننەتە**

وەڵام : بەڵێ دورستە با رەمەزان واجب بێ و عومرەش سوننەت ، چونکە پێغەمبەر لە فەتحی مککە بە رۆژوو نەبوو (انه فتح مكة في السنة الثامنة من الهجرة في رمضان ولم يصم بقية الشهر) اخرجه مسلم ،بەیەك دەنگی موسڵمانان وبەبەڵگەی قورئان و سوننەت ،رێبوار لەسەری واجب نیە بەرۆژوو بێ، ئبنو عەبباس دەڵێ (قد صام رسول الله وافطر ، فمن شاء صام ومن شاء افطر)اخرجه البخاري) واتە پێغەمبەر لە سەفەر بەرۆژوو بووە ،وەبە رۆژووش نەبووە ،جا ئەوەی حەزدەکا با بەرۆژووبێ ،ئەوەی حەزدەکابا بەرۆژوونەبێ، جا ئەم سەفەرە بۆ گەشت و گوزاروخوشیش بێ، با ئۆتۆمبێلی فێنك و خۆشیش بێ هەر دورستە بە رۆژوو نەبێ ، چونکە سەفەر هۆکارە بۆ دورست بوونی .

ئاگاداری : هەر کاتێ رێبوار بۆ هەبوو نوێژ کورت بکاتەوە، بۆی هەیە بەرۆژوو نەبێ، بەڵام ئەبێ قەزای بکاتەوە.

## پرسیاری ٩٠/ ئایا ئاو لە دەم وەردان رۆژوو دەشكێنێ ؟

وەلاٌم : (التمضمض) واتە ئاو لە دەم وەردان و دوایش فرێبدرێ، رۆژوو ناشكێنێ ، ئەگەر بێ ویستی خۆی هەندێك لە گەرووی چووە خوارەوە هەرناشكێ،چونكە ئەو شتانەی رۆژوو دەشكێنن ئەبێ (٣) مەرجی هەبێ

١-ئەبێ ئەو كەسە زانيبێتی ئەو شتە رۆژوو دەشكێنێ بۆ نموونە(عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَتْ أَفْطَرْنَا عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ (ﷺ) يَوْمَ غَيْمٍ ثُمَّ طَلَعَتْ الشَّمْسُ) ئەسمای كچی ئەبوبكر دەلێ لەسەردەمی پێغەمبەر رۆژوومان شكاند لە رۆژێكی تەم ومژ ، دوای رۆژ دەركەوت ، (جا بەتەواوی رۆن نەبۆتەوە ئایا ئەم رۆژووە گێردراوەتەوە یان نا)

٢-ئاگای لەخۆبێ و لەبیری نەچووبێ بۆ نموونە پێغەمبەر دەفەرموێت ((ﷺ))(مَنْ نَسِيَ وَهُوَ صَائِمٌ، فَأَكَلَ أَوْ شَرِبَ، فَلْيُتِمَّ صَوْمَهُ، فَإِنَّمَا أَطْعَمَهُ اللَّهُ وَسَقَاهُ) - مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ) ، واتە: كەسێكی بە رۆژوو لەبیری چوو خواردی یان خواردیەوە با رۆژوو وەكەی تەواو بكات، خوا ئەم خواردن و خواردنەوەی پێ بەخشیوە

٣- بە ویستی خۆی بێ بە زۆری نەبێ بۆ نموونە خوا دەفەرموێت. ﴿مَن كَفَرَ بِٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ إِيمَٰنِهِۦٓ إِلَّا مَنۡ أُكۡرِهَ وَقَلۡبُهُۥ مُطۡمَئِنُّۢ بِٱلۡإِيمَٰنِ وَلَٰكِن مَّن شَرَحَ بِٱلۡكُفۡرِ صَدۡرٗا فَعَلَيۡهِمۡ غَضَبٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَلَهُمۡ عَذَابٌ

عَظِيمٌ ١٠٦ النحل، واتە: هەرکەسێك پاش موسڵمانبوونی ئەگەر بە زۆرلێکردن و ئازاردان_ ووشیەکی کوفر بەسەر زمانیدا بێت، بەڵام لە کاتێکدا کە ئیمان لە دڵیدا جێگیرو دامەزراو بێت، ئەوە هیچی لەسەر نیە... بەڵام گەر دڵی بە بێ باوەڕ بوون خۆشنوود بێت، ئەوە خەشم و غەزەبی خودا دەیگرێتەوە، وە لە دواڕۆژدا سزایەکی زۆر گەورەیان بۆ هەیە .

## پرسیاری ٩١/ئایا خەنە لە قژ ( پرچ ) نان رۆژوو دەشکێنێ؟

وەڵام:نەخێر رۆژوو ناشکێنێ ، وە زیانی بۆ نوێژیش نیە ، چونکە رێگر نیە لە گەیشتنی ئاو بۆ تەڕبوونی ئەندامەکانی لەش.

## پرسیاری٩٢/ئەگەر کەسێکی بە رۆژوو لە رەمەزان خۆی رشاندەوە، ئایا رۆژوو وەکەی دەشکێ؟

وەڵام: ئەگەر ئەو کەسە بزانێ ئەم کارە رۆژوو دەشکێنێ ئەوە رۆژوو وەکەی دەشکێ و ئەبێ قەزای بکاتەوە ،بەڵام ئەگەر نەیدەزانی دەشکێ ، ناشکێ ، وە ئەو کەسەی بێ ویستی خۆی دەرشێتەوە هیچی لەسەر نیە وەك پێغەمبەر دەفەرموێت(مَنْ ذَرَعَهُ الْقَيْءُ فَلَا قَضَاءَ عَلَيْهِ وَمَنْ اسْتَقَاءَ فَعَلَيْهِ الْقَضَاءُ )اخرجه احمد وابوداود

واتــە:٥ هەرکەسـێك رشـانەوەی بەسـەردا زاڵ بوو،قەزاکردنـەوەی ڕۆژووی لەسـەر نیە،هەرکەسـێکیش بەقەسـدی خـۆی بڕشـێنێتەوە، بارۆژوووەکە قەزابکاتەوە.

**پرسياری٩٣/ئايا ماناى ئەم فەرمووده: ( أسبغ الوضوء ، وخلل بين الأصابع ، وبالغ في الاستنشاق ، إلا أن تكون صائماً ))**
**رواه أبو داود والترمذي، )چيه؟**

وەلاّم :( وَبَالِغْ في الاسْتِنْشَاقِ ، إلاَّ أنْ تَكُونَ صَائِماً) واتە لە دەست نوێژ ئاو لە لوتت وەربکەو بەرەوسەرەوەش هەڵیمژە،مەگەر بـەرۆژوو بی،واتە لەحالەتی رۆژوودا هەڵنەمژی ،چونکە دەچێتە نـاو بۆشـایی و رۆژووەکە دەشکێ،

**پرسيار٩٤/ئايا ئەگەر بـە نـەزانين و لەبيرچـوون شـتێك بكـەى رۆژوو دەشكێ؟**

وەلاّم: هـەموو ئـەو شـتانەی رۆژوو دەشـکێنن ئەگـەر بـە نـەزانین ئەنجام دران رۆژوو ناشکێنن، بەبەڵگـەی (رَبَّنَـا لَا تُؤَاخِـذْنَآ إِن نَّسِـينَآ أَوۡ أَخۡطَأۡنَا ٢٨٦ البقرة

**(ربنا لا تؤخذنا ان نسينا...)** مرۆڤی موسڵمان دەبێت هەمیشە ڕوو لە خودا بێـت و، داوای ڕەحمـەتی لـێ بکـات، ئـەوەتا لێـرەدا خـودای

میهرەبان خۆی فێرمان دەکات بڵێین: ئـەی خـودای پـەروەردگارمان! ئەگەر لە بەجێهێنانی بڕیـارو فەرمانێکتـدا شـتێکمان لـە بـیر چـوو وە نەمانکرد، یاخود لە ئەنجامدانیدا هەڵەیـەکمان کـردو، وەکـو پێویسـت ئەنجاممان نەدا، خودایە! لێمان مەگرەو بمانبەخشە.

خـوای گـەورە دەفـەرموێت ﴿وَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ فِيمَآ أَخْطَأْتُم بِهِۦ وَلَٰكِن مَّا تَعَمَّدَتْ قُلُوبُكُمْۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ (الأحزاب ٥)

واتـە: لەسـەر ئەوانـەی بەهەڵـە ئەیکـەن تاوانبـار نابن،بـەڵام لەسـەر ئەوانەی بە قەستی دڵ ئەیان کەن تاوان بار ئەبن

وەلە بوخاریـدا هـاتووە(عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَتْ أَفْطَرْنَا عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ (ﷺ) يَوْمَ غَيْمٍ ثُمَّ طَلَعَتْ الشَّمْسُ) ئەسمای کچی ئەبوبکر دەڵێ لەسەردەمی پێغەمبەر ڕۆژوومـان شـکاند لـە ڕۆژێکـی تـەم ومـژ ، دوای ڕۆژ دەرکـەوت ، بـەڵام سـەبارەت بەلـە بیرچوون پێغەمبـەر دەفـەرموێت(: إِذَا نَسِيَ فَأَكَلَ وَشَرِبَ فَلْيُتِمَّ صَوْمَهُ فَإِنَّمَا أَطْعَمَهُ اللهُ وَسَقَاهُ)أخرجه البخاري)

واتـە: ئەگـەر کەسـێ لـەبیری چـوو،خواردی یـان خواردیـەوە، بـا ڕۆژووەکەی تەواو بکات ،خوا ئـەم ئـەم رزقـەی پێداوە.هـەموو ڕۆژوو شکێنەکان ڕۆژوو ناشکێنن **مەگەر بزانێ وئاگای لەخۆبێ وبە مەبەست بێ.**

**پرسـيار( ٩٥ ) ئەگـەر لـەكاتی قـوم لـە سـۆندەدان ( هەڵمـژين ) ی بەنزيين يان ئاو بێ دەستی خۆم هەندێك چووە خواری بـۆ قورگ ئايا رۆژوو دەشكێ؟**

وەڵام : هەر شتێك بچێتە خوارێ لە گەروو ئاو بێ يان بـەنزين يـان جگە لەوانـەش، رۆژوو ناشـكێنن مـادام شـتەكە بـێ دەسـتی خـۆت بووە.

**پرسياری( ٩٦ ) ئايا ئاو بە سەری خۆتدابكەی يـان مەلـەوانی بكـەی رۆژووت دەشكێ؟**

وەڵام : بەڵێ دورستە مرۆڤی بە رۆژوو لە كاتی گەرما ئاو بەسـەری خۆی دابكات ، ياخود جلی خۆی تەڕبكات ياخود مەلەوانی بكـات يـان خۆی نقۆمی ئاو بكات ، لە هـاوەڵانی دەگێرنـەوە پێغەمبـەر (يَصُـــبُّ عَلَى رَأْسِهِ الْمَاءَ وَهُوَ صَائِمٌ مِنَ الْعَطَشِ أَوْ مِنَ الْحَـــرِّ).اخرجـه احمـد) واتـە پێغەمبـەر (ﷺ) بـە رۆژوو بـوو لـەتێنوەتی يـان لەگـەرما ئـاوی بەسەری خۆدا دەكرد. _ وە عەبدوڵای كوری عومەر بەرۆژوو بوو جل و بـەرگی خـۆی تـەڕدەكرد، _ وە ئەنەسـی كـوڕی مالـك حـەوزێكی هەبوو خۆی تيا نقوم دەكرد بە رۆژووش بوو.خوای گەورە ئاسانی بۆ بەنـدەكانی دەوێ وەك دەفـەرموێت (يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلْعُسْرَ ١٨٥ البقرة ﴾

خــوا ئاســانکاری بــۆ ئێــوە دەوێــت و نایــەوێت (پەرســتن و فەرزەکانتان) لەسەر قورس و گران بکات.

## پرسیاری٩٧ ئایا کەی زەکات واجب بووە؟ وە بەڵگە چیە لەسەری؟

وەڵام : زەکات روکنی سێیەمی ئیسلامە،لە مانگی شەوالی دوومـی کۆچی واجـب کـراوە، بەبەڵگـەی قورئـان سـوننەت لـە(٨٢) جێگـا لـە قورئـان نوێـژو زەکـات فـەرمان بـەجێهێنانیان کراوە،بـۆ نموونـە(١. وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ وَارْكَعُوا مَعَ الرَّاكِعِينَ (البقرة:٤٣) واتـە: دوای ئەوەی داوای بـاوەڕ هێنـان و موسـڵمان بـوونی لێکـردن، ئینجـا دەفەرموێت: نوێژ بکەن و بە چاکیی ئـەنجامی بـدەن، وە لـەوماڵـەی کە خودا پێیداون زەکات بدەن وە لەگـەڵ ئەوانـەدا کـە بـە جەماعـەت نوێژ دەکـەن، ئێـوەش لەگەڵیانـدا نوێـژەکانتان بکـەن، چـونکە ئـەوە مایەی یەککگرتنتانەو، وا دەکات بە هاوارو هانای یەکتریەوە بچن.

وە بەڵگـەی فـەرموودە (الإِسْلاَمُ أَنْ تَشْهَدَ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّـــهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدَاً رَسُولُ اللهِ، وَتُقِيمَ الصَّلاَةَ، وَتُؤْتِيَ الزَّكَاةَ، وَتَصُـــومَ رَمَضَـــانَ، وَتَحُجَّ الْبَيْتَ إِنِ اسْتَطَعْتَ إِلَيْـــهِ سَـــبِيلاً)مسلم لـەم فـەرموودە تـەنها باسـی(وَتُؤْتِيَ الزَّكَاةَ)( سێیەم: شـت لـە ئیسـلامدا: ئـەبێ زەکـات بدەی، زەکات ئەوەیە: مسوڵمانی هەبوو نەختێك لە ماڵی خۆی ئەداتە مرۆڤـی هــەژارو نــەدار، ســاڵێ یــەکجار، بــە مــەرجێك بگاتــە ڕاددەی

زەکات، لە چل بەش یەك بەش زەکاتە، واتە: لە سەدا دوو و نیو، ماڵی بازرگانیش هەروایە، لە دانەوێڵە: لە چل تەنەکە بە تەنەکەی نەوت (٤) تەنەکە زەکاتە، لە ڕەشە وڵاخ لە (٣٠) سەر، یەك گوێلکی نێری یەك ساڵە، وە لە (٤٠) سەر یەك گوێلکی مێی دوو ساڵە، لە مەڕو بزن لە چل سەر، یەك بزنە، یان یەك مەڕە، لە (١٢١) دوو لە (٢٠١) ٣ لە (٤٠٠) چوار .

هەروەها سەرفیترەی ڕەمەزان لە جیاتی خۆتو هاوسەرو منداڵت، دوو کیلۆ دانەوێڵە، یان نرخەکەی ئەبێ بدەی بە هەژار، لەسەر فەرموودەی ئیمامی ئەبوو حەنیفە ڕەحمەتی خوای لێ بێ.

## پرسیاری۹۸ ئایا ئەو چینانە کێن کە زەکاتیان پێ دەچێ؟

وەڵام : دیاریکردنی ئەم چینانە خوا رازی نەبووە پێغەمبەریش دیاری بکات بەلکو خۆی لەم ئایەتە دەست نیشانی کردون(إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلۡفُقَرَآءِ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱلۡعَٰمِلِينَ عَلَيۡهَا وَٱلۡمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمۡ وَفِي ٱلرِّقَابِ وَٱلۡغَٰرِمِينَ وَفِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِۖ فَرِيضَةٗ مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ٦٠ التوبة

ئەم ئایەتە پیرۆزە هەشت چین دەستنیشان دەکات کە دەشێت ماڵی زەکاتیان پێ بدرێت. دەفەرموێت: بێگومان زەکات بۆ ئەو کەسانەیە کە:

١- (لِلۡفُقَرَآءِ) هەژاران

٢- (وَٱلۡمَسَٰكِينِ) بۆ ئەو کەسانەیە کە دەستکورتن و ئەوەی هەیانە بەشیان ناکات.

٣-(وَٱلۡعَٰمِلِينَ عَلَيۡهَا) وە بۆ ئەو کەسانەیشە کە کاروباری کۆکردنەوەو دابەشکردنی زەکات هەڵدەسوڕێنن، لەو کەسانەی ئەو کارەیان پێدەسپێررێت.

٤-( وَٱلۡمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمۡ) هەروەها زەکات بۆ ئەو کەسانەیشە کە تازە موسڵمان بوون تا ئایینی ئیسلام بە جوانیی لە دڵیاندا جێگیر ببێت. ئەم کۆمەڵە ئەوانەیش دەگرێتەوە کە مەصڵەحەت و بەرژەوەندی گشتی وابخوازێت بەشیان بدرێت، وەك ئەو کەسە ناودارو سەرۆکانەی کە کاتی خۆی موسڵمان دەبوون و لەناو هۆزو عەشیرەتەکەی خۆیاندا قسە ڕۆیشتوو بوون، تا خراپەیان لێ نەوەشێتەوەو بێ دەنگ بن.

٥- (وَفِي ٱلرِّقَابِ) هەروەها بۆ کڕینی دیل و ئازاد کردنیان...

٦-( وَٱلۡغَٰرِمِينَ) هەروەها زەکات بۆ ئەو کەسانەیشە کە قەرزاریی ڕوویان تێ دەکات، تا قەرزەکانیان بدەنەوەو لەژێر باری گرانی قەرز ڕزگاریان ببێت.

٧-( وَفِي سَبِيلِ ٱللَّهِ) هەروەها بۆ گشت کارێکیش کە سوودی کۆمەڵگەی موسڵمانانی تیادابێت. وەك کاروباری ڕێکخستنی غەزاو

قوتابخانەو نەخۆشخانەو هەتیوخانە... وە هەر کارێکی تری بەخێرو بەکەڵك.

٨- (وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ ) هەروەها زەکات بۆ ئەو کەسانەیشە کە لە کاتی سەفەردان و خەرجییان لێ دەبڕێت و ناتوانن بە ئاسانی بگەڕێنەوە بۆ ماڵی خۆیان.

( فَرِيضَةٗ مِّنَ ٱللَّهِ ) ئەمە لە بابەتی زەکاتەوە کە فەرزێکە لەلایەن خوداوە لەسەر دەوڵەمەندەکان و دەبێت ساڵانە زەکاتی ماڵ و پارەو ماڵاتیان بدەن.

(وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ) خودایش زانیارو ئاگادارە کەچی بۆ ڕێکخستنی ژیانی بەندەکانی چاك و بەسوودە.. هەروەها خودایەکی دانایەو لەهەر شتێکدا کە فەرمانی پێ دەکات مەبەستێکی هەیەو لە خۆڕاو بەبێ هوودە نیە

## پرسیاری /٩٩ ئایا دورستە زەکات وەر بگریت ئەگەر لەم (٨) چینە نەبووی؟

وەلاّم : حەرامە کەسێك لەم هەشت چینە نەبێ زەکات وەربگرێ بۆ نموونە (فَأَتَاهُ رَجُلٌ فَقَالَ أَعْطِنِى مِنَ الصَّدَقَةِ. فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى لَمْ يَرْضَ بِحُكْمِ نَبِىٍّ وَلاَ غَيْرِهِ فِى الصَّدَقَاتِ حَتَّى حَكَمَ فِيهَا هُوَ فَجَزَّأَهَا ثَمَانِيَةَ أَجْزَاءٍ فَإِنْ كُنْتَ مِنْ تِلْكَ الأَجْزَاءِ أَعْطَيْتُكَ

حَقَّكَ)رواه ابو داود، واتە پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر پێ ووت زەكاتم بدێ، فەرمووی خوا بۆی خۆی رازی نەبووە بە حوكمی پێغەمبەرێك یان غەیری پێغەمبەرێك، لە دابەشكردنی زەكاتدا،بەلكو بۆ خۆی دابەشی كردوە بۆ بەسەر (٨) بەشدا،جا ئەگەر لەم بەشانەی بەشت دەدەم.

**ئاگاداری** : یەكەم دەولەت لە مێژووی مرۆڤایەتی كە شەری لەسەر زەكات كردیە، دەولەتی ئیسلامە چونكە ماف هەژارانە،لە شەری هەلگراوەكان دەیان هاوەلی قورئان لەبەر شەهید بوون.ئەبوبەكر فەرمووی(أَنَّ أَبَا بَكْرٍ الصِّدِّيقَ استشار عليًّا ، رَضِيَ الله عَنْهُمَا ، فِي أَهْلِ الرِّدَّةِ ، فَقَالَ : إِنَّ اللَّهَ ، تعالى ، جَمَعَ الصَّلاَةَ وَالزَّكَـاةَ ، وَلاَ أَرَى أَنْ تُفَرِّقَ ، فَعِنْدَ ذَلِكَ قَالَ أَبو بَكْرٍ : لَوْ مَنَعُونِي عِقَالاً لَقَاتَلْتُهُمْ عَلَيْهِ كَمَا قَاتَلَهُم عَلَيه رَسُول الله (ﷺ)واتە : ئەبوبەكر راوێژی بەعەلی كرد خوا لە هەردوكیان رازی بێ دەبارەی هەلگەراوەكان فەرمووی خوا نوێژو زەكاتی لێك جیا نەكردۆتەوە وەمن وا ئەبینم لێك جیا نەكرێنەوە ، جا ئەبوبەبكر فەرمووی ئەگەر كاژێلەیەكیان نەدا كە لەوە پێش ئەیاندا بە پێغەمبەر ئەجنگم لە دژیاندا، بەلێ ئەی هەژارانی جیهان خوێن بۆ ئێوە رژا تاكو مافتان بگرێتەوە، دەبا ئێوەش دەنگ و رەنگتان هەر بۆ ئیسلام بێت، وە لە هەمان كاتدا زۆر دوعا بۆ دەولەمند وخوا پێداوە زەكاتدەرەكان بكەن.

## پرسیاری(١٠٠ )حوكمی نوێژی جەژن و كاتەكەی و چۆنیەتی ئەنجام دانی نوێژەكە چییە؟

وەڵام :**حوكمەكەی**: نوێژی جەژن سوننەتێكی جەخت لەسەر كراوە(مؤكدة)یە چونكە پێغەمبەر(ﷺ)لە وەتەی داندراوە وازی لێ نەهێناوە تا كاتی وەفاتی، هەروەها هاوەڵەكانی بەردەوام بوون لەسەری، دەبێت بە جەماعەت بكرێت وە بە تەنهاش دەكرێت (هەموو موسڵمانێك دەتوانێت ئەم نوێژە ئەنجام بدات پیاو بێت یان ئافرەت یان نیشتەجێ بێت یان گەشتیار)

**كاتەكەی**: كاتەكەی دەست پێدەكات بە هەڵاتنی خۆر و بەردەوام دەبێت تا لادانی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان

**چۆنیەتی ئەنجام دانی**: نوێژی جەژن دوو ركاتە بە(الله اكبر)ی ئیحرام دەست پێ دەكات پاشان دوعای سەرەتای نوێژ دەخوێنیت و ،پاشان حەوت جار (الله اكبر) دەكات لەگەڵیاندا دەستی بەرز دەكاتەوە بۆ ئاستی شانی هەروەك و (الله اكبر)ی ئیحرام ، وە لە نێوان (الله اكبر)ەكاندا سوننەتە بڵێت (سُبْحَانَ الله ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ ، وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ ، وَاللَّهُ أَكْبَرُ)پاشان (اعوذ بالله.....) دەكات و سورەتی فاتیحە دەخوێنێت پاشان سورەتێك یان چەند ئایەتێك دەخوێنێت جا كە هەستایەوە بۆ ركاتی دووەم پێنج جار (الله اكبر) دەكات، ئەمە بێجگە لە (الله اكبر) ی هەستانەوەكە و پێش خوێندنی سورەتی (فاتیحە) شتەكانی تر وەكو نوێژی بەیانی یە.

## پرسیاری( ١٠١ ) ئاداب و سوننەتەکانی جەژن چین؟

١- خۆی بشوات و بۆنی خۆش لە خۆی بدات و جل و بەرگی نوێ بپۆشێت یاخود باشترین جل و بەرگی خۆی کە هەیەتی.

٢- بەیانی رۆژی جەژن سوننەتە خەڵك زوو بچن بۆ مزگەوت .

٣- سوننەتە لە جەژنی رەمەزاندا پێش چوون بۆ نوێژی جەژن شتێك بخورێت بەڵام لە جەژنی قورباندا سوننەتە کە هیچ نەخوات تا دەگەڕێتەوە لە نوێژ

٤- سوننەتە نوێژ خوێن لە ڕێگەیەکەوە بچێت و لە ڕێگەیەکی ترەوە لە مزگەوت بگەڕێتەوە

٥- ئاشت بونەوە لەگەڵ ئەو کەسانەی کە لێت تۆراون

## پرسیاری ( ١٠٢ ) ئایا پاداشتی عومرە لە رەمەزان چەندە؟

وەڵام: عومرە پاداشتی لە رەمەزان بە ئەندازەی یەك حەجی سوننتە، وەك پێغەمبەر ((ﷺ) دەفەرموێت: (عُمْرَةٌ فِي رَمَضَانَ تَعْدِلُ حَجَّةً – أَوْ حَجَّةً مَعِي )) متفقٌ عَلَيْـــهِ. واتـە : پێغەمبەر فەرموویەتی عومرە لە رەمەزان پاداشتی هاوتای حەجی سوننەتە ، یاخود پاداشتی وەك حەجە لەگەڵ من .جگە لە رەمەزانیش عومورە هەر پاداشتی رۆزە ، وەك پێغەمبەر دەفەرموێت (العُمْرَةُ إِلَى العُمْرَةِ كَفَّارَةٌ لِمَا بَينَهُمَا ، وَالحَجُّ المَبْرُورُ لَيسَ لَهُ جَزَاءٌ إِلاَّ الجَنَّةَ ) متفقٌ عَلَيْهِ .. واتـە :

عـومره بـۆ عـومره گونـاهی نێوانیـان دەسـڕێتەوە ، وە حـەجی وەرگیراوە پاداشتی نیە جگە لەبەهەشت، جا یەك نوێژ لە مككە بە سەد هەزار نوێژە ، لە مەدینە لە مزگەوتی پێغەمبەر ((ﷺ) بەهەزار نوێژە ، (صَلاَةٌ فِي مَسْجِدِي هَذَا خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ صَلاَةٍ فِيمَا سِوَاهُ إِلاَّ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ ). رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ) بەتایبەتی رەوزەی پیرۆز مێرگێكە لە مێرگەكانی بەهەشت ، وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت (مَا بَيْنَ بَيْتِي وَمِنْبَرِي رَوْضَةٌ مِنْ رِيَاضِ الْجَنَّةِ ). رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ وَ مُسْلِمٌ . واتە: نێوان گۆرەكەم و مینبەرەكەم مێرگیكە لە مێرگەكانی بەهەشت، بەرێزان حەزدەكەم ئەم روداوە راستەقینەتان بۆ بگێرمەوە : لەسەر عومرە و رەوزەی پیرۆز خێزانی ( كاك ملا یاسین) خوشكە (ئەڤین) كە دەكاتە بوكی كاك حاجی (حسین خەتی ) خزمێكی خۆمانە لە ٢٠١٥ /٤/١ لە سەر تازییەی دایكی كاك (شوان رابەر ) لە ناكاو هەردوو چاوی لە دەست دەدا ، هەموو دكتۆرە باشەكان دەكەن و دەرمانی كوردەواری بەكار دێنن، هیچ چارەی نابێ، بەلام ئەم خۆشكە زۆر ئارام گرو شوكر دەبێ، دوا جار بریار دەدەن بچنە عومرە و زیارەتی (رسول الله) ، لە شاری مەدینە ،لەگەل ناو هێنانی ئەم شارە دڵت دەفرێ ، چونكە ئازیز لەوێ ساكینە، بەڵێ لەوێ ئافرەتێك دەستی دەگرێ و دەیباتە رەوزە ، نزیكەی (٤) كاتژمێر لەوێ دەمینێتەوە، زۆر دوعا دەكات ، دواتر دێنە دەرەوە، چەند

مەترێك دەرۆن ، خوشكە (ئەڤین) دەڵێ بەرمدەن چاوەكانم دەبینێ، جا( الله اكبر) دەكەن و سوجدەی شوكر دەبەن، لە شەوی ٥/٥/ ٢٠١٥پاش ماگێك و پێنج رۆژ خوای گەورە روناكی چاوەكانی گەراندەوە.بەلأم : نابێ ئەوە لەبیر بكەین ئەم شارە بۆیە گەورەیە ، چونگە مزگەوت و لاشەی فەخری عالەمی لێیە، وەپێغەمبەریش مرۆڤە وەك ئێمە ، بەلأم خوا رێزی لێناو و گەورەی كردیە، كەواتە سەرچاوەی هەموو شتێك هەر خوایە. وەك خوای گەورە دەفەرموێت(وَأُخْرَى لَمْ تَقْدِرُوا عَلَيْهَا قَدْ أَحَاطَ اللَّهُ بِهَا وَكَانَ اللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيراً) ٢١ الفتح واتە:

وە چەندەها (غەنیمەتی) تر هەیە كە هێشتا دەسەڵاتتان نی یە بەسەری دا بێگومان خوا ئاگای لەهەموویانە وە خوا هەمیشە بەسەر هەموو شتێكدا بە توانایە.

روداوێكیتر لەسەر عومر موستەفا یەحیا موحمەد لە دایك بووی ٢٠٠٧ دانیشتوی قوشتەپەیە توشی نەخۆشی هەناسە تەنگی دەبێ دكتۆری عەرەب و تورك وبیانی پێدەكەن ، چەندین ئەشیەعەو سۆنارو پشكنینی بۆ دەكەن، بەلأم چارەی نیە، دكتۆرەكان دەڵێن قورگی توشی هەوكردن بوو،ئەبێ لەژورێكی تایبەتی دابێ لەم ژورە نەیەتە دەرەوە، باوكی بای پێنج شەش وەرقە دۆلار یاری بۆ دەكرێ تا وەرس نەبێ لەم ژوورە،دواتر باوكی دەڵێ خوایە بەناوی تۆ

سەفرێك دەكەین بۆ عومرە بەڵكو لەوێ شیفاش بۆ كورەكەم بدەی،لەمككەی پیرۆز دەچنە لای دكتور(هشام) پاش پشكنین دەڵێ هەندێ تۆ گوڵە بەرۆژەوكودی لەنزیك سیەكانی لەجیهازی هەناسیدایە، نشتەرگەری بۆ دەكات لەنەخۆشخانەی(نور)ی حوكومی، ئەم منداڵە خوای گەورە شیفای بۆ نارد هەناسە تەنگی نەما،ئەمەش بەرەكەتی عومرە.

## پرسیاری (١٠٣) ئایا لە مرۆڤی بەرۆژوو دوعا قەبولە؟

وەلام : بەڵێ مرۆڤی بە رۆژوو لای خوا زۆر گەورەیە ،دوعای گیرا دەبێ، وەك پێغەمبەر دەفەرموێت: (ﷺ)

ثَلاَثَةٌ لاَ تُرَدُّ دَعْوَتُهُمُ الإِمَامُ الْعَادِلُ وَالصَّائِمُ حَتَّى يُفْطِرَ وَدَعْوَةُ الْمَظْلُومِ تُحْمَلُ عَلَى الْغَمَامِ وَتُفْتَحُ لَهَا أَبْوَابُ السَّمَاءِ وَيَقُولُ الرَّبُّ وَعِزَّتِي لأَنْصُرَنَّكَ وَلَوْ بَعْدَ حِينٍ.) صحيح سنن ابن ماجة ومسند أحمد قال الشيخ الأرناؤوط : صحيح بطرقه وشواهده واتە : سێ كەس دوعایان قەبولە، پێشەوایەكی دادپەروەر ، بەرۆژوو تا فتار دەكاتەوە، دوعای ستەم لێكراو لەسەر هەور دەروات و دەرگای هەموو ئاسمانەكانی بۆ دەكرێتەوە ، تا دەچێتە خزمەت خوا ، خوا دەفەرموێت سویند بەشكۆی خۆم وەلامت دەدمەوە و سەرت ئەخەم ئەگەر ماوەیەكی تریش بێ.

**<u>نموونەیەکی واقیعی</u> لەسەر مرۆڤی بەرۆژوو ئافرەتێکی لای خۆمان**
بەناوی (عائشە عزیز) زۆر بە رۆژوو دەبوو، زمانی زۆر دەپاراست لەغەیبەت ، نوێژی سوننەتی زۆر دەکرد، زۆر داوای لە خەڵك دەکرد دەیگوت دوعام بۆ بکەن خوا لە سوجدە روحم بکێشیّ، بەڵیّ ئازیزان ئەم ئافرەتە دینداره لەکاتێك بە رۆژوو بوو ، لەسەر بەر ماڵی نوێژ بوو، لە شارۆچکەی خەلیفان رۆژی ٨/٤/ ٢٠١٥ لەناو سوجدە روحی گەرایەوە لای خوای گەورە، (انشاء الله ) فتاری لە بەهەشت کردیتەوە لای صالیحان .بەراستی مردنێکی خۆش و سەربەزانەیە،خوا بە قسمەت ئێمەش بکات، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت:( أَقْرَبُ مَا يَكُونُ الْعَبْدُ مِنْ رَبِّهِ وَهُوَ سَاجِدٌ ، فَأَكْثِرُوا الدُّعَاءَ). رَوَاهُ مُسْلِمٌ. واتە : نزیکترین کات کە بەندە لە خوا زۆر نزیکە ئەو کاتەیە ، کە لە سوجدەدایە، جا زۆر دوعا بکەن لە سوجدە.

سُبْحَٰنَ رَبِّكَ رَبِّ ٱلْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿١٨٠﴾ وَسَلَٰمٌ عَلَى ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٨١﴾
وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ

لەگەڵ دوعای خێر بۆ خۆم و دایك وباوکم
هەولێر- کوردستان
مزگەوتی عوزێری
٧ی شەعبانی ١٤٣٦ - ٢٠١٥/٥/٢٥

## سەرچاوەکان

١. قورئانی پیرۆز
٢. پوختەی تەفسیری قورئان محمد ملا صالح
٣. تەفسیری ئاسان برهان محمد امین
٤. تەفسیری گوڵشەن نظام الدین عبدالحمید
٥. پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەر علی باپیر
٦. الفقه المنهجی بە زمانی کوردی
٧. فقه السنه سیدسابق وەرگێرانی حمه امین
٨. پرسیارو وەلامی شەرعی لە سەرمەزهەبی ئیمامی شافعی عمر شیخ نورلدین موفتی
٩. روناکی رب العالمین عبدالله عبدالعزیز هەرتەلی
١٠. فتاوی نور علی الدرب محمد بن صالح العثمین
١١. نوری مینەبەر فاتح ملا رسول شاەستێنی
١٢. یسالونك حسام الدین موسی عفانه
١٣. ١٠٠٠سوال وجواب في الفقه على مذاهب الاربعة الشيخ محمد علي القطب
١٤. لەزمانی ئەوەوە بۆمان دەگێرنەوە شاخەوان عەلی مامۆکی

# ناوەڕۆك